لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

98

ساڵی نۆیەم
ئابی ٢٠١٦

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو
گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو
گەشەپێدانی مرۆیی



## بەیادی شارەزووریی مامۆستاو پێشەوا



## هەتا ئێرەو بەس!

## لە سەرکەوتن گەورەتر!

## چۆن دەبیتە بازرگانێکی سەرکەوتوو؟

## ژاپۆنییەکان هەرگیز پاشەکەوت ناکەن!

## بازاڕی تاعەت!

## خامەی خەمێك!

خاوەنی ئیمتیاز
د. مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر
د. عادل محەممەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین
بەرزان ئەبوبەکر

No: 98
ئابی
2016

دەستەی نووسەران
ئەسکەندەر ڕەحیم
بێگـەرد فـــارس
زاهــیـــر زانـــا
محەممەد مێرگەیی
محەممەد هاشم
وەهـاب حەسـیب
یەحیـــا محەممەد

ڕاوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

دیزاین
پشتیوان عبدالرحمن

تایپ
کەلسووم جەلال

ناونیشانی گۆڤار
سلێمانی: گەڕەکی باخان- شەقامی بۆتان- خانووی ژمارە ٧٤
تەنیشت باخچەی بەکر صدقی، بەرامبەر کینگ سپۆرت
٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ - ٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧
هەولێر: ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠
bryarmagazine
bryarmagazin@gmail.com
bryarmagazine

چاپ: پیرەمێرد
دابەشکردن: پەیك/ 07708649210
نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی نۆیەم - ژمارە 98 -ئابی 2016




## کارگێڕیو بازاڕسازی



# هەتا ئێرەو بەس!

سبەینان لەخەوڕابیو چاوەڕوانی هیچ هەواڵێکی نوێ نەکەیت بۆ پێشکەوتنی وڵاتەکەت!

خۆزگە بە دەیان ساڵ لەوەو پێش بەریتو ئاوات بە گەڕانەوە بۆ دواوە بخوازی، کارەساتێکی گەورەیە!

ئەو کاتەی نەوەکانمان لە فەرهەنگی سەردەمی نوێی نەتەوەکەیاندا، بۆ شانازییەك دەگەڕێن، بەدیی ناکەن.. دەردێکی کوشندەیە!

ئەو ساتەی هەست بە خنکانی ژیانو بێمانابیەکەی دەکەی!

هەست دەکەی مرۆڤ، لە بازنەیەکی بەتاڵدا دێتو دەچێت!.....

ماندووبوونێکی بێسوود، پچڕانی پەیوەندییەکان، نەمانی بەزەییو میهرو خۆشەویستی، هەموو ئەمانە دەبنە سیمای سەردەم!

ئەو دەمەی خوێندنەوەو کتێب، دەبنە ئەفسانەو شوێنکەوتنی کوێرانەش دەبێتە بڕوانامەی باڵا!

پەروەردە ماڵاوایی دەکاتو هەموومان بەدەست منداڵەکانمانەوە، زەلالەتمانە!

ئەو کاتەی وێڕای هەژاری، شانازی بە ئیسرافو زیادەڕۆییەوە دەکەین! ئەو کاتەی تەنها بە پەیوەندییە ئەلیکترۆنییەکان، هەواڵی یەکدی دەپرسین.. ئیدی بۆچیو لە پێناوی چیدا، درێژە بە ژیان بدەین؟!

ئەو کاتەی هەموو زانستو ماریفەتی دونیا، لە مێشکی منداڵیکی کورددا، "سکۆتەر"ێك ناکات!

ئەو کاتەی هەموو کتێبخانەکانی شار، هێندەی دوکانێکی مۆبایل، قەرەباڵغ نییە!

ئەو کاتەی بەسەر برینی وڵاتەکەمدا، لە دەیان کەناڵی ڕاگەیاندنەوە سەما دەکەین!

ئەو کاتەی لەنێو دەهۆڵو زوڕنادا، دەنگی گریانو هاوارو نووزەی هەژارانی وڵاتەکەم ون دەبێت!

ئەو کاتەی حەز دەکەین، هەموو ئەو شتانەی دەیانخۆین، کوردی بن؛ چونکە لە یەك خواردندا دەستێکی باڵامان هەیە!

ئەو کاتەی نازانین بۆ کوێ دەچینو چی دەکەینو چی چاوەڕێمان دەکات!

ئەو کاتەی بە پانتایی وڵاتێك، پلان بوونی نییە!

ئەو کاتەی خەریکە ناتوانرێت پارێزگاری لە هیچ بکرێت، تەنانەت لە پرسیاری تاقیکردنەوەکانیش!

ئەو کاتەی "گەل"ێك مامۆستاکانی گەدان!

قوتابییەکانی بێئاگان...

ئەو کاتەی وڵات بێ شوانو بێ خەمخۆرو بێ کەسو بێ دڵسۆزو بێ چرایە!

ئەو کاتەی وەکو بێکەس دەڵێت:

میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری هەر هەوڵ ئەدەن داخەکەم وردو درشتی شێتو شەیدای عانەیە سەنعەتو عیلمو مەعاریف زەڕرەیەك باوی نییە پیاوەتی لایان بە تەنها، چەفتەو جامانەیە

ئیدی کاتی ئەوە هاتووە بڵێین: ئیدی هەتا ئێرەو بەس..

لەمە زێتر بەرەو کوێ؟!!

# کارگێڕی بە گوفتار

مرۆڤی گەشبین، دەتوانێت بە دەرزی، بیرێك هەڵبکەنێت!

ناپلیۆن پۆناپارت

جۆگەلەو کانیاوەکان چۆن پێدەکەنن،
ئەگەر هەورەکانی ئاسمان نەگرین؟
ئەگەر منداڵیش نەگری، شیری دەست دەکەوێت؟؟

جەلالەدینی ڕۆمی

مرۆڤ ناتوانێت بە مانای وشە، ببێتە زانا،
تا سەرەتا، بە مانای وشە نەبێتە مرۆڤ!

فوفالس

ئێمە کاتێك کار دەکەین، ماندوو دەبین،
بەڵام هەست بە ئاسوودەیی و پشوودان دەکەین..
ئەگەر بەدڵسۆزی کارەکانمان ئەنجام بدەین.

جۆرج ساند

ئەوەی بەبێ ماندووبوون بەدەست دێت،
بەبێ هۆ لەدەست دەچێت!

ئۆسکار وایڵد



# لە سەرکەوتن گەورەتر!

محەممەد ڕەشوان، یاریزانی جیهانیی جۆدۆ، دوای ماندووبوونێکی زۆر، گەیشتە یاریی کۆتایی لە پاڵەوانێتیی جیهانی بۆ جۆدۆ، کە لەوێدا کەوتە بەرامبەر یاریزانی ژاپۆنی "یاماشتا".

لە سەرەتای یارییەکدا، کە محەممەد، بەوپەڕیی وریایی‌و لێهاتووییەوە یاریی دەکرد، "یاماشتا" پێی ڕاستی پێکراو دەرفەتێکی گەورە بۆ محەممەد درووست بوو، بۆ شکستهێنان بە بەرامبەرەکەی‌و سەرکەوتن بەسەریدا!

بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمانە، محەممەد هیچ هێرشێکی، ئاڕاستەی پێیە پێکراوەکەی نەکرد، بەڵکو ئارەزووی سەرکەوتنی نەما!

لەو کاتەدا، ڕاهێنەرەکەی هانی دەدا، کە لێدانی کوشندە، ئاڕاستەی پێیە پێکراوەکەی بکات، بەڵام محەممەد بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوەو گوتی:

"ئایینەکەم ڕێگام پێ نادات، کاری وەها بکەم"

"محەممەد" لەو پاڵەوانێتییەدا، بە ویستی خۆی، شکستی هەڵبژارد، بەرامبەر سەرسوڕمانی هەموو جیهان‌و بە دەستی خۆی، میدالیای زیوی کردە ملی بەرامبەرەکەی‌و بە خەندەیەکی پاکی منداڵانەوە، کە لێوی بەجێ نەدەهێشت پیرۆزبایی لێ کرد.

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١.لە ژیاندا هەندێك شت هەن، لە سەرکەوتن‌و تێکشکاندنی بەرامبەر گرنگترن.

٢. ئاکاری بەرزو مرۆڤایەتیی مرۆڤ، زۆر لە سەرکەوتن‌و پلەی بەرز گەورەترە.

٣. ئەو خۆشییەی لە شکاندنی بەرامبەردا هەستی پێ دەکەیت، زۆر مەوداکورت‌و کاتییەو زوو بەسەر دەچێت، بەڵام ئەو خۆشییەی لە ڕێگای مرۆڤبوون‌و گەورەیی خۆتەوە بەدەستی دەهێنیت، هەرگیز لەناو ناچێت.

٤. ئەوەی بە میهرو خۆشەویستی‌و هەستبەرزی پێمان دەکرێت، هەرگیز بە مشتەکۆڵەو بەکارهێنانی هێز، دەستمان ناکەوێت.

٥. گەر میدالیایەکی زیوی، نیشانەی سەرکەوتن بێت لە یەکێك لە کایەکاندا؛ ئەوا ئاکاری بەرز، میدالیای سەرکەوتنە لە هەموو کایەکانی ژیاندا!

٦. مرۆڤە گەورەکان ، کە پاڵەوانی ژیان‌و تاجی سەری مرۆڤایەتین، کەمن.. بەڵام تەنها ئەوان پاڵەوانی ڕاستەقینەن!

٧. سەرکەوتن بەسەر کەسێکی لاوازداو قۆستنەوەی خاڵی لاوازی، پاڵەوانێتی نییە، بەڵکوو دڕندەیی‌و داماڵینە لە هەموو بەهایەکی مرۆڤانە!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

بۆئەوەی خزمەتێکی ڕاستەقینە پێشکەش بکەیت،
پێویستە میوانداری دوو شت بکەیت، کە نەدەکڕدرێن، نە پێوانە دەکرێن
بە ماڵو سامان، ئەوانیش: دڵسۆزی لە کاردا، دەستپاکیو ئەمینداریییە.

دونالد ئین.ئیدمر

ئەگەر سەد هەزار کەس کۆ ببنەوەو
تاک تاک هەوڵ بدەن بۆ جووڵانی تەنێك کە قورساییەکەی تەنها یەك تەنە، بێگومان
دەستەوسان دەبنو ناتوانن بیجووڵێنن، بەڵام ئەگەر تەنها ٥٠ کەس تواناکانیان یەك
بخەنو پێکەوە هەوڵی جووڵانی هەمان تەن بدەن، زۆر بە ئاسانی دەتوانن بیجووڵێنن!

جۆرج واشنتۆن

مرۆڤ ناتوانێت ببێتە سەرکردەیەکی گەورەو بەناوبانگ،
ئەگەر لە ناخەوە بە سەرکەوتنی شوێنکەوتووەکانی، هەست بە خۆشحاڵیو بەختەوەری نەکات.

دەبلیو .ئەی.نانس

زۆرێك لە خەڵکی دەپرسن، جیاوازیی نێوان سەرکردەو سەرۆك چییە؟
سەرکردە سەرکردایەتی دەکات، سەرۆك بەڕێوەبەرایەتی دەکات!

سیۆدۆر ڕووزفێلت

هەنگ ناتوانێت، بەتەنها هیچ کارێك ئەنجام بدات،
تەنها بەپێکەوەبوون نەبێت، سەبارەت بە مرۆڤیش هەروایە، مرۆڤەکان پێکەوە دەتوانن کارە
گەورەکان ئەنجام بدەن.. کوردیش دەڵێت: تاقەسوارە تۆزی نییە!

ئۆگەست کۆمت



سەلیقەی کارگێڕی

بەشی شەشەمو کۆتایی

## ڕەوشتو ئاکاری سەرکردە

# چۆن دەبیت بە سەرکردە؟!

### سەرکردە مامۆستایە!

گەرچی ئەم ئاکارەمان، لە کۆتاییدا دانا، بەڵام هەر سەرکردەیەك، کە مێژوو ناسیویەتی، لە سەرەتاداو بەر لە هەموو شتێك، مامۆستاو فێرکار بووە، گرنگ لەوەدایە بزانین، فێرکردن سنووردار نییەو لە فێرکردنی کارمەندەکاندا، کە چۆن کار بەئەنجام بگەیەنن، کورتی هەڵنەهێناوە. سا لەبەرئەوەیە، سەرکردە وێڕای گواستنەوەی سەلیقەو کارامییەکانی ئیشو کار، پێویستی بە گواستنەوەی سەلیقەو کارامییەکانی هەیە بۆ یاریدەدەرەکانی، ئیدی لە گەشەپێدانی متمانەبەخۆبوون، خۆشویستنی خەڵکی، هیوابەرزی، جۆشوخرۆش، سەرڕاستیو ئەمەکداری، یەکلاکردنەوەو هەموو ئەو ئاکارانەی کە پێشتر ئاماژەیان پێکراو باسکران، یاریدەی یاریدەدەرەکانی دەدات.

وەلێ بەڕێوەبەر، ئەم کارامەییو شارەزاییە سەرکردایەتییانە، چۆن فێری ژێردەستەکانی دەکات؟

بیرێکی وردو جوان، لەو مامۆستایانە بکەرەوە، کە کاریگەرییەکی بەهێزیان لە ژیانتدا جێ هێشتووە؛ جا ئەوانە، چ لە قوتابخانەدا بن، چ لەماڵەوە، یان لە یاریگاو کاردا بن.

بێگومان کەسێك هەیە، وای لێ کردوویت، هەست بکەیتو بزانیت، کە دونیایەکی دیکە هەیە، لەوەی کە تۆ مەزەندەت دەکردو بیرت لێ دەکردەوە، فراوانترو جوانترو قووڵترە، هەروەها بەدڵنیاییەوە، کەسێك هەیە، فێری ئەوەی کردوویت، بۆ خۆت کێشەکانت چارەسەر بکەیت، لەسەر کۆمەڵە توانایەکیش ڕای هێناویت، بە خەیاڵیشتدا نەدەهات، ببیت بە خاوەنیان، ئێستە ئا ئەوە تۆیت، لە بەرەنگاربوونەوەی کێشە تازەکانو بارودۆخە گۆڕاوەکاندا، دەتوانیت ئەم توانایانە بەگەڕ بخەیت.

### ئایا ئەو ئاکارانەی باسکران زۆرە؟

هەر کەسێك خاوەنی ئەو ئاکارە جوانانە بێت، کە سەرکردەی پێیان بەهرەمەندە، دەبێتە کەسێکی دەگمەن، یان تەواوعەیار بێت.. بەڵام تا پێت دەخەیتە سەر سەرەتای ڕێگە، پێڕستی ئەو شتانەی پێت دەکرێن، دەخەینە بەردەستت، تا بە ئاڕاستەی درووستدا بڕۆیت.

ئەم شتانە، تەنها گۆڕانکارییەکی ئاسانن لە تێڕوانینی کاروباردا، یان سووکە گۆڕانێکە لە هەندێك هەڵوێستدا، خەریکە سەرنجی نادەیتو گوێی پێ نادەیت، ئەم گۆڕانکارییانە، تا ئەو ئەندازەیە، ئاسانن، کە جارجارە بۆئەوەی لەبیرت نەچێت، پێویستت بە کەسێکە، بیرت بخاتەوە. دەسا بۆ هەندێك کات تاقی ناکەیتەوە؟ هەر هیچ نەبێت، تا خۆت ببینیت، ئەنجامەکانی سوودبەخشە، یان نا.

**١. سەرنجی کەسانی دیکە بدە:** بێگومان لە سەرنجدانو ڕامان لە خەڵکیدا، چێژێکی ڕاستەقینە هەیە، ئەو خەڵکانە، لە ئەندازە بەدەر، هزروهۆش دەورووژێنن، کە شێوازی بیرکردنەوەی ئاسایی تێ دەپەڕێنن.

**٢. بایەخدانی خۆت بە دەوروبەر دەرببڕە:** بابزانن تۆ بایەخیان پێ دەدەیت، ئەو بایەخدانە، بە ڕوانینو ڕەفتارەکانت دەرببڕە، بە جۆرێك لە جۆرەکان، لێ بگەڕێ، با بزانن کە تۆ، دڵسۆزیت بۆیان.

**٣. خوێنشیرین بە:** کە دەڵێیت: «بەخێر بێن»، لە دڵەوە بیڵێ، کە دەپرسیت: «حاڵو باڵ چۆنە؟» بەقووڵیو بەبایەخەوە بپرسە.. بزەت با لەسەر لێو بێتو لە چاوی خەڵکی بڕوانە.

**٤. کاری کەسانی دی، بەرز ڕابگرە:** کارێك کە بەباشترین شێوە ڕاپەڕێنراوە، شیاوی پەسەندیدانو تاریفکردنە، بگرە جارجارەش، ڕاپەڕاندنی بەشێکی کارەکە، دەتوانرێت بە هۆشوگۆش، ئاوڕێکی لێ بدرێتەوەو دەسخۆشانەو پەسەندی بۆ بگوترێ. ستایشو پێداهەڵگوتنی کارمەند، هیچی تێ ناچێت، بەڵام کۆمەڵێك دەسکەوتی زۆرو چاوەڕواننەکراوی لێ دەکەوێتەوە، کە بە با و لای خەیاڵیشدا نەهاتووە.

**٥. دان بە هەڵەکانتدا بنێ:** پێشتریش ئەمەمان گوت، بەڵام ئەم کارە، دووبارەکردنەوە هەڵدەگرێت، دواتر ئەم دانپێدانانە، وەك بەڵگەی هێزو هەڵکردن لێی دەڕوانرێ، نەك بە نیشانەی کزیو لاوازیو شلو شێواوی.

**٦. با «من» لە هەموو چێشتێکدا نەسکوێ نەبێت:** بۆ تەنیا ڕۆژێ، واز لە وشەی «من»و «خۆم»و «بۆخۆم» بهێنە. لەم وازهێنانەدا، ئەزموونێکی سەیر بۆ بەسەرخۆدازاڵبوون دەبینیتەوە، ئەوە ئەزموونێکە لە دووبارە دۆزینەوەی خۆتو زانینی خراپیو چاکییەکان دێتە کایەوە، کە بەبیروهۆشتدا نەدەهات، لای تۆ هەبن.

ن: عبدالله العثمان و: جەلال عەبدوڵڵا

# ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە

**٥١- گوێ لە سەرکەوتووەکان بگرە.**

تێکەڵی کەسە سەرکەوتووەکان بکە، گوێ لە کەسە مەزنەکان بگرە، لەبارەی ژیانی ناودارانەوە بخوێنەرەوە، لە ژیانیانەوە فێربە چۆن گەیشتوون بە سەرکەوتن، پیاوچاکان بکە بەنموونە بۆ خۆت، لاسایی سەرکەوتووەکان بکەرەوە، هاوڕێی نوێژخوێنان بکە، نزا بکە بۆ چاکەخوازان، لەگەڵ عەمرەکاراندا گەشت بکە، ئیبن جەوزی دەگێڕێتەوە، کاتێك ئەو کەسانەی لای بوون وتیان: ڕەنگە کاتی تۆمان گرتبێت، ئەویش گوتی: بەڵێ لەگەڵ هاوەڵو شوێنکەوتوواندا بووم، ڕێنموونیو ئامۆژگاریی ئەوانم وەردەگرت، کاتێك ئێوە هاتن، وازم لێهێنانو لەگەڵ ئێوەدا دانیشتم.

**٥٢- ئێستا ئەنجامی بدە.**

درووشمی کۆمپانیای نایك(Nike) بریتییە لە (just do it)، درووشمێکی جوانەو لەبابەتەکەمان سوودمان پێدەگەیەنێت، ئەگەر ویستت کارێك ئەنجام بدەیت؛ ئەوا بەبێ دوودڵی هەرئێستا ئەنجامی بدە، ئەگەر ئەو کارە ئێستا ئەنجامی نەدەیت؛ ئەوا هیچ کاتێکی ترمان دەست ناکەوێت بۆ ئەنجامدانی، گرفتی ئەو کەسانەی سەرکەوتنیان دەوێت، ئارەزووی سەرکەوتنیان هەیە، بەڵام دوای دەخەنو ئەمڕۆو سبەی دەکەن، سەرەنجام سەرکەوتوو نابن. ئەگەر دەتەوێت بگەڕێیتەوە ئێستا بگەڕێرەوە، دوای مەخە، مەڵێ دوای ژنهێنان، دەتەوێت زانست وەربگریت، ئێستا دەست بکە بەزانستخوازیو مەوەستە.

**٥٣- ڕێکپۆشی**

دەمەوێت پرسیارێکت لێ بکەم، کاتێك جلو بەرگێکی جوانو شیك دەپۆشیتو خۆت لەئاوێنەدا دەبینیت، ئایا هەست بە گوڵەکانو هەست بەخۆشی ناکەیت؟ زۆر بەجوانی خۆت دێتە بەرچاو، بۆیە پێداگر بە لەسەر ئەوەی شێوەو ڕەنگو ڕووت، جوانو سەرنجڕاکێش بێت، با هەمووان ئاگاداری ڕێکپۆشی، جلوبەرگی باش، گوڵاوە تایبەتو قسە جوانەکانت بن، بەوە زیاتر خۆشەویستیو ڕێز بەدەست دەهێنیت، بۆ نەفسی خۆت، زیاتر ڕێزو ویقار بەدەست دەهێنیت.

**٥٤- فێربوونو فێربوونو فێربوون..**

هەموو ڕۆژێك فێر ببەو بخوێنەرەوە، خودی خۆت پێش بخە، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زانستو فێربوونت زیاتر دەبێت، فێر بەو بەکاری بهێنە، ئەگەر بەکاریشی نەهێنیت، لەبەرئەوەی ئەگەر تۆ ڕێبواربیتو لەسەر ڕێگەی ڕاست بیتو بەهێواشی بجووڵێیت، باشترە لەکەسێك خێرابێتو لەڕێگەی هەڵەدا بێت، باشترین ئەو کەسەیە کە خێرایەو لە ڕێگە ڕاستەکەدایە، فێردەبێتو دوای ڕێنماییەکان دەکەوێت، سەیری نەخشەی ڕێگا دەکاتو خێرایە لە گەیشتن بە ئامانجەکانی، کار بەو زانستە دەکات کە فێری بووە.

**کۆتایی**

گەیشتن بە کۆتا وێستگە، سەرەتایەکە بۆ دەرچوون بەرەو سەرکەوتنی مەزن، سوودوەرگرتنی باشتر لە کات، بەهۆی شتگەلێکی سادەوە، خوای گەورە پڕبەرەکەتی بکات، دێتە بەرهەمو بەردەگرێت، بەروبومێکی زۆر، لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە سوودی بەخەڵکانێك گەیاندبێت، بەمکارە بچووکەم ڕێگەم بۆ ڕۆشنکردبێتنەوە؛ بۆئەوەی هەست بەگرنگی کات بکەن، لە گرنگترین کاردا وەبەرهێنانی تێدا بکەن، درك بەوە بکەن کام کارە گرنگترینەو چۆن تەرکیز بخەنەسەری، دەستنیشانی هۆکارەکانی بەفیڕۆچوونی کاتو تواناکانیان بکەنو نەیهێڵن..





کاروان عوسمان

# (١٠)ڕاستی بۆ هەڵبژاردنی داتابەیس

بەگشتی داتابەیس بریتییە لە بانکێك، یان پێگەیەکی کۆمپیوتەری، کە داتاو زانیارییەکانی بەشێوەی پۆلێنکراو تێدا پاشەکەوت دەکرێت، بە جۆرێك کە بەکارهێنەر بتوانێت، بە ئاسانترین رێگاو خێراترین کات، بگات بە سەرچاوەی ئەو زانیارییەی دەیەوێتو بتوانێت بەئاسانی بەرێوەی ببات.

کاتێك بڕیار دەدەیت، زانیارییەکانت بکەیتە ناو سیستەم، یان داتابەیس، پێویستە بۆ هەڵبژاردنی ئەم داتابەیسە، ١٠ راستی بزانیت.

**١- ئاسان بەکارهێنان:**

یەکەم مەرجی بەکارهێنەر، بۆ بەکارهێنانی داتابەیس، سانایی‌و بوونی رووکارێکی گونجاوە بەشێوەیەك کە سەرجەم بەشەکانی پۆلێن کرابێت لەو داتابەیسەدا؛ تا بەکارهێنەر بەئاسانی بتوانێت کۆنترۆڵی داتاو ئامارەکانی بکات.

هەروەها پێویستە هەر بەکارهێنەرێك، سەلاحییەتی تایبەت بەخۆی هەبێت. واتە: کاتێك بەکارهێنەر پۆستی فرۆشتنی هەیە، وا باشترە لەناو داتابەیسەکەدا، تەنها ئەو بەشانەی تایبەتە بەفرۆشتنەوە چالاك کرابێت، ئەمەش وا دەکات کارمەند بەئاسانی‌و بەبێ ئاڵۆزبوون، کاری رۆژانەی بکات. بۆ هەموو بەشەکانی تریش بەهەمان شێوە سەلاحییەتیان بۆ دیاری بکرێت.

**٢- پاراستن:**

گرنگترین لایەنە بۆ کڕیار؛ چونکە هەموو زانیاریی خۆی تێدا دادەنێتو بەگشتی سەرمایەی خۆی تێدا داخڵ دەکات کە بریتییە لە (پارە، کاڵا، قەرز، ڤیست، .....).

پێویستە لە کاتی هەڵبژاردنی داتابەیسدا، گرنگییەکی زۆر بە لایەنی ئەمنی داتابەیسەکە بدرێت؛ تا پارێزراوبێت لە کێشەکانی:
online attacks – offline attacks –)
(Hardware – Software

أ. **Software**: ئەو داتابەیسەی کە هەڵی دەبژێریت، پێویستە پرۆگرامەکەی دابمەزێتو (Install) بکرێتە سەر ئەو کۆمپیوتەرەی کە کاری لەسەر دەکەیت، نابێت ئەم بەرنامەیە بەشێوەی (Portable) کاربکات. واتە: بەهۆی کرداری کۆپیکردن بگوازرێتەوەو لەسەر کۆمپیوتەری تر کار بکات، بەبێ ئەوەی ئەو بەرنامەیە لەو کۆمپیوتەرە هەبێت. مەبەست لێی پاراستنی داتابەیسەکەیە لە سڕینەوەو بردنی.

ب. **Hardware**: یەکێك لە کێشە دیارەکان، کە هەمیشە دژی تەکنەلۆجیای کۆمپیوتەرە، بریتییە لە کێشەی پارچە رەقەکانی کۆمپیوتەر لەوانە (هارد، رام، سی پی یو، مەزەر بۆرد، پاوەر یونت، ....) ئەم پارچانە تووشی کێشەی دزین، یان سووتان دەبن، بۆیە پێویستە ئەو داتابەیسەی کە هەڵی دەبژێریت، دوو تایبەتمەندی تێدابێت؛ تا بە دووربین لە فەوتانو دزینی زانیارییەکان ئەوانیش: بە (دنگڵ) کاربکات: "دنگڵ یو ئێس بی" فلاشێکە وەك کلیل وایە، رێگە بەکردنەوەی داتابەیسەکە دەدات، هەتا بەکارهێنەر بتوانێت کاری لەسەر بکات.

-توانای (Backup)کردن: ئەگەر ئەو داتابەیسە توانای باکئەپکردنی هەبێت، رۆژانە باکئەپی داتابەیسەکە بکەیت؛ ئەوا لە کاتی تێکچوونی کۆمپیوتەر، یان لەکار کەوتنی هارد دیسکەکە تووشی فەوتانی زانیارییەکان نابیتو دەتوانیت لەرێگەی ئەو باکئەپەوە، هەموو زانیارییەکان بگەڕێنیتەوە، بەڵام گرنگە ئەو داتابەیسە، فایلی (Backup)کردنەکەی خاوەنی پاشگرێك، یان فۆرماتێکی جیاواز بێت.

ج. **offline attack**: هێرشە ناوخۆییەکان، هەمیشە بەهۆی خراپی بەکارهێنەر، یان داخلکردنی زانیاری هەڵە، گۆڕان لە زانیارییەکاندا روو دەدەن، یان کارمەندێکی تر هەوڵی دەسکەوتنی زانیاری، یان تێکدانی زانیارییەکان دەدات؛ بۆ ئەوەی تووشی ئەم کێشەیە نەبیتو هەڵبژاردنی داتابەیسەکەت درووست بێت؛ دەبێت داتابەیسەکەت، توانای دانانی ناوو وشەی نهێنیی هەبێت بۆ هەر بەکارهێنەرێكو بەپێی کاری بەکارهێنەر، سەلاحییەت بداتە بەکارهێنەرو نەهێڵێت لە کارەکەی خۆی، زیاتر کار لە داتابەیسەکە بکات.

د. **online attack**: هێرشی دەرەکی، یان هاککردن، دەبێت ئەو کۆمپیوتەرەی داتابەیسەکەی تێدا دابەزیوە، کۆنێکت بێت بە ئینتەرنێتەوە بۆ پاراستنو دڵنیایی لە داتابەیسەکە، بەگشتی پێویستە سەرجەم ئەو خاڵانەی کە پێشتر باسکرا لە داتابەیسەکەدا هەبێت؛ تا بەدوور بیت لە کێشەی هاککردنو دەستکاریکردنی زانیارییەکانی ناو داتابایسەکەت، پێویستە مەرجەکانی پاراستن لەو کۆمپیوتەرەدا هەبێت.

**٣- خزمەتگوزاریی دوای فرۆش:**

سانایی لە بەکارهێنانی داتابەیسدا بەس نییە؛ چونکە بەکارهێنەر، بەهۆی فراوانیی کارەکەیەوە، پێویستی بە زانیاری‌و یارمەتیدان دەبێتو سەرەنجام دەبێت، لایەنێك هاوکاری بکات، یان هەندێ کات داتابەیسەکە تووشی کێشە دەبێت، جا بەهۆی خراپ بەکارهێنان بێت، یان بەهۆی نەگونجاندنی لەگەڵ سیستەمی کارپێکردنی کۆمپیوتەرەکە، یان بەهۆی ڤایرۆسەوە.

لەبەرئەوە وا باشترە، ئەو لایەنەی داتابەیسەکەی ئامادەکردووە پشتگیری‌و یارمەتیی بەکارهێنەر بکات، جا لە رێگەی پەیوەندیی تەلەفۆنی، یان لەرێگەی ئیمەیڵ، یان هاتنە نێو سیستمەکەوە بێت لەرێگەی ئینتەرنێتەوە.

٤- توانای گونجاندن:
گەشەسەندنی سیستەمەکە، لەگەڵ زانیاریو بازرگانیت بکە مەرج لەکاتی هەڵبژاردنی داتابەیسەکە. لە کاتی کڕینی داتابەیسەکە لەوانەیە بەهۆی گرانییەوە، یان هەرهۆیەکی تر بێت، نەتەوێت لە سەرەتاوە هەموو بەشە ویستراوەکانی بۆ زیاد بکەیت، یان زۆر کات بەهۆی گۆڕانی پلانی کارەکەت، یان گەشەسەندنی بەشو لقی تر دەکەیتەوە، کە ئەمەش دەبێت لە داتابەیسەکەدا شوێنی تایبەت بەخۆی هەبێت. بۆیە پێویستە لەکاتی هەڵبژاردنی داتابەیسەکەدا، لایەنی فرۆشیار ئاگادار بکەیتەوە، کە ئەو بەشانەی کە لە ئایندەدا کارت پێ دەبێت، بەئاسانیو تێچوویەکی کەم لەسەر هەمان داتابەیس چالاك بکات، تا بەدوور بیت لە گۆڕینی داتابەیسەکەو دووبارە داخڵکردنی زانیارییەکانو خەرجکردنی تێچوویەکی تر بۆ دامەزراندنی داتابەیسێکی تر.

٥- نوێکردنەوە: نوێبوونەوەکان هەمیشە چارەسەرکردنی کێشەکانو تایبەتمەندییەکان لەخۆ دەگرێت، جا ئەو تایبەتمەندییانە لە ڕووکارو دیزاینی بەرنامە بێت بۆ ئاسانکردنی بەکارهێنان، یان لەڕووی زیادکردنی فرمان بێت بۆ داتابەیسەکە، یان پەرەپێدانی بواری پاراستنی داتابەیسەکە بێت، یان لە هەر ڕوانگەیەکی تر بێت، ئەمانە وا دەکات، هەمیشە لایەنێك هەیە چاودێری داتابەیسەکە بکاتو هەوڵی بڵاوکردنەوەی وەشانی نوێی بدات.

بۆیە لەکاتی هەڵبژاردنی داتابەیسەکەتدا، بپرسە لە نوێکردنەوەی؛ تا بەدوور نەبیت لەم تایبەتمەندییە.

٦- پشتگیریو هێنانەوە:
* پشتگیری (Backup): هەڵگرتنی سەرجەم زانیارییەکانو ڕێکخستنەکانی ناو داتابەیسەکەیە لە فایلێکی بچووکدا، هەتا لە کاتی تێکچوونی بەرنامە، یان ڕەشکردنەوەی زانیارییەکان، بتوانیت لە ڕێگەی ئەم فایلە بچووکەوە، سەرجەم زانیارییەکانت بگەڕێنیتەوە، قەبارەی ئەم فایلە هەتا بچووکتربێت باشترە.

لە سەرجەم داتابەیسە پێشکەوتووەکاندا، گرنگییەکی تەواو دراوە بە پشتگیریو بە دوو ڕێگا دەتوانیت، پشتگیری هەڵبگریت:
أ. ئۆتۆماتیك: مەبەست لێی ڕۆژانە بەئۆتۆماتیکی پاشەکەوتی پشتگیرییەکە بکاتە نێو شوێنی دیاریکراو لەناو هاردەکەت.
ب. ویستراو: مەبەست لێی هەرکات بەکارهێنەر ویستی پاشەکەوتی پشتگیرییەکە، بکاتە نێو ئەو (هاردە، یان فلاش میمۆرییە، یان سی دی)ی کە دەیەوێت.
* هێنانەوە(Restore): گەڕاندنەوەی زانیارییەکانە بۆ ناو داتابەیسەکە بەهۆی ئەو فایلە بچووکەوە، کە لە پشتگیریدا دروستمان کرد.

بەگشتی سوودی پشتگیریو هێنانەوە لە کاتی کێشەکاندا دەردەکەوێت، بۆ نموونە کە داتابەیسەکە لەکار دەکەوێت، دەتوانیت جارێکی تر بەرنامەکە دابمەزێنیتەوەو بە هۆی پشتگیرییەکەوە سەرجەم زانیارییەکان بگەڕێنیتەوە، یان زانیارییەکان لە کۆمپیوتەرێکەوە بگوازیتەوە بۆ کۆمپیوتەرێکی تر، کە بەرنامەکەی لەسەر دابەزیوە.

٧- کۆنترۆڵکردنی بەکارهێنەر: زۆر کات ئەو شوێنانەی کە داتابەیس بەکار دەهێنن زیاتر لە بەکارهێنەرێکیان هەیە، لەبەرئەوە پێویستە ڕیزبەندییەك هەبێت، لە نێوان بەکارهێنەرەکانو پلەکانیان دیاری بکرێت لە بەرێوەبەرەوە، تا کارمەندێك. پێویستە لە داتابەیسەکەدا، تایبەتمەندی کۆنترۆڵکردنی بەکارهێنەری هەبێت؛ تا بتوانیت سەلاحییەتی بەکارهێنان بەپێی پۆستی کارەکەی بدرێتە بەکارهێنەرەکان. ئەمەش چەند سوودێکی هەیە:
- هەر بەکار هێنەرێك، ناوو وشەی نهێنی خۆی دەبێت. - دەتوانرێت کاتی کارکردنی بەکارهێنەر، لەسەر داتابەیسەکە دیاری بکرێت.
- بەکارهێنەر تەنها دەتوانێت کار لەو بەشانە بکات کە تایبەتە بە پۆستی کارەکەیو ناتوانێت کار لەسەر بەشەکانی تر بکات.
- بەڕێوەبەر دەتوانێت بزانێت چ بەکارهێنەرێك، زانیارییەکانی دەستکاری کردووە، یان سڕیوەتەوە.

٨- یەکخستن:
بەشێکی تری کاری داتابەیس، بریتییە لە یەکخستنی سیستەمەکان کە بۆ ئاگادارکردنەوەو بازاڕسازی بەکار دێت. مەبەست لێی توانای یەکگرتنی داتابەیسەکەیە، لەگەڵ سیستەمی ناردنی کورتەنامەو ئیمەیڵو ....

یەکخستنی داتابەیس لەگەڵ ئەم سیستەمانەی تر، دەتوانرێت بەکار بهێنرێت بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی؛ بۆ ئاگادارکردنەوەی کڕیارو قەرزدارو خاوەن فیستەکان، یان بۆ بواری بازاڕسازیو گەیاندنی سوپاسنامە بۆ کڕیارەکان لەدوای هەر وەسڵێك بەشێوەی ئۆتۆماتیکی بنێرێت بۆ کڕیار.

٩- ڕاپۆرتەکان:
لەدوای داخڵکردنی کاڵاو زانیارییەکانی ڕۆژانەت، پێویستت بە بینینی ئەنجامی کارەکەتە بۆ ئاگاداربوونی کاری ڕۆژانەت. ڕاپۆرتەکان لە نێو داتابەیسدا، ئەنجامی کارەکەت بەئاسانی پێ دەداتو پێویستە لەناو داتابەیسەکەدا، چەند ڕاپۆرتێکی تێدا بێت لەوانە: (ڕاپۆرتی جووڵەو ماوەی کاڵا، کڕینو فرۆشتنو گەڕانەوە، ڕاپۆرتی ماوەی کاڵا، ڕاپۆرتی قازانجو زەرەر، ڕاپۆرتی حسابی کەسەکان (قەرزارو داواکارەکان)، ڕاپۆرتی باڵانسو بودجەی گشتی، ڕاپۆرتی گەنجینەکان، ڕاپۆرتی بەرهەمهێنان، ڕاپۆرتی خەساربووەکان، ....).

بەگشتی هەر بەشێك لەم جۆرە ڕاپۆرتانە، پێویستە بتوانێت بە شێوەی گرووپ، یان بەشێوەی دیاریکردنی کات (ڕۆژو مانگو ساڵ) ببینیت. بۆ نموونە: ڕاپۆرتی قازانجو زیان، لە بەروارێك بۆ بەروارێکی تر، بەویستی خۆت.

١٠- فرمانەکان: کۆمەڵێك تایبەتمەندین، کە لە هەر بەرنامەیەکدا هەیە، کاری ئاسانکاریو نزیککردنی ڕێگاکانە تا بەکارهێنەر بە زووترین کاتو خێراترین ڕێگا بگات بەو زانیارییەی کەدەیەوێت.

فرمانەکان لە داتابەیسدا، بەشێك لە کارە بنچینەییەکان دەکات، بەڵام گرنگە ئەو داتابەیسەی هەڵی دەبژێریت، خاوەنی زۆرترین فرمان بێت، ئەمەش دەکەوێتە سەر تیمی پرۆگرامسازی ئەو داتابەیسە. چەند فرمانێك کە باشترە لە داتابەیسەکەدا هەبێت:
گەڕانی زیرەك (Smart Search): لە زۆربەی زۆری داتابەیسەکاندا، گەڕان هەیە، بەڵام وا باشترە گەڕانی زیرەك هەبێت؛ تا بەزووترین کات، بگەیت بەو زانیارییەی کە دەتەوێت.

یەکێك لە سوودەکانی ئەوەیە، ئەگەر تەنها بەشێکی کەمیش لە ناوەڕاستی ناوەکە بنووسیت، خۆکارییانە هەر نووسینێك ئەو ناوەی تێدا بێت دەیبینێتەوە.

بینینی ئەنجام: پێویستە زۆرترین ڕاپۆرتی گشتیو وردبینیو شیکاری، بەدەست بهێنرێتو باشترە ڕاپۆرتەکان لە چوارچێوەی ستانداردی کارەکەتدا بێت؛ تا پسپۆڕی کارەکە، لە کەمترین ماوەدا، لێی تێ بگاتو زانیارییەکان ببینێت.

ڕێکخستنی تایبەت: هەر داتابەیسێك پێویستە خاوەنی کۆمەڵێك ڕێکخستنی تایبەت بەخۆی بێت؛ تا لەوێوە بتوانیت کۆنترۆڵی بەرنامەکە بکەیت.

ڕێنمایی فێرکاری: پێویستە ئەو داتابەیسە ڕێنمای کارکردنی گشتی لەگەڵ بێت؛ تا بەکارهێنەر بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت لە کاتی پێویستدا.

# چۆن دەبیتە بازرگانێکی سەرکەوتوو؟

وەهاب حەسیب

بازرگانی.. گۆڕینەوەی شتێکە بە شتێك، خستنەڕووی شمەکە بە مەبەستی فرۆشتن، بەشێوەیەکی ئاسایی، خەڵك كاتێك شمەکێك دەکڕن، لە بەرانبەردا نرخەکەی دادەنێن، ئەو کەسەی سەرپەرشتیی کاری فرۆشتنەکە دەکات، شارەزایە بە جۆرو پێکهاتەی کاڵاو شمەکەکە، بەو کەسە دەگوترێت بازرگان.

بازرگانی، یەکێکە لەو پیشانەی لە دێر زەمانەوە، مرۆڤ پێی ئاشنابووە، سەرەتا بە گۆڕینەوەی شمەك بە شمەك دەستی پێ کردووە، دوای پەیدابوونی دراو، بازرگانی گۆڕانکاری بەسەردا هاتو لە شێوەی کڕینو فرۆشتندا گەڵاڵە بوو، بازرگانەکان کاڵاو شمەکەکانیان لە بازاڕدا دەخستە ڕوو، نرخەکانیان دیاری دەکردو خەڵکیش نرخەکەیان دەدا.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژگارو پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا، بازرگانی گۆڕانکاریی گەورەی بەسەرداهات، لە ئێستادا کڕیار لەڕێگای ئینتەرنێتەوەو لە ماڵەکەیدا، دەتوانێت پێداویستییەکانی بکڕێت، واتە: تەکنەلۆژیا لە پرۆسەی کڕینو فرۆشتندا. کاتی بچووكو شوێنی کەم کردۆتەوە.

لەم ڕۆژگارەدا، کە بەهۆی ڕکابەرییەوە، بەردەوام بازاڕ ناجێگیرە، هەروەها ڕۆژانە کاڵاو شمەکی نوێ، دەخرێتە بازاڕەوە، خواستی بەکاربەر هەمیشە لە گۆڕاندایەو... هتد، لێرەدا پرسیارە جەوهەرییەکە سەر هەڵدەدات، چۆن لەم نێوەندەدا بتوانیت، ببیت بە بازرگانێکی سەرکەوتوو؟

**١- بیرۆکە:** سەرەتا پێویستە ئەو کەسە خاوەن بیرۆکەیەکی دیاریکراو بێت، یاخود ئەو بوارەی ئەو مەبەستێتی دەست بەکاربێت تێیدا، هەروەسا دڵنیا بێت لەوەی دەتوانێت بەکردار بیرۆکەکەی جێبەجێ بکات. بازرگان دەبێت پێداگر بێت لەسەر کارو جۆری کارەکەی، هەروەها گشت ئەو تەواوکاریانەی پەیوەستن بە کارەکەیەوە، دەبێت بزانێت چۆن لە بوارەکەیدا کارسانایی دەکات، ئەو کات دەبێت بە بازرگانێکی سەرکەوتوو.

**٢/ بوونی سەرمایەی:** دوای دیاریکردنی بیرۆکەی بازرگانی، سەرمایە پێویستە بۆ دەستپێکی هەرکارێك؛ بۆئەوەی خاوەنکار بتوانێت پێداویستییە داراییەکانی پێ تەواو بکات. بۆ ئەوەی بازرگان بە لێهاتووییەوە کاری بازرگانی بکات، پێویستە بنەماکانی کارەکەی دیاری بکاتو هیچ بوارێك فەرامۆش نەکات، بۆ نموونە: بەراوردی باشی بەرهەمەکەی بە بەرهەمەکانی دیکە، بڕی ئەو کاڵاو شمەکانەی لە بازاڕدا دەیانخاتە ڕوو، چۆن دەبێتە جێباوەڕی کڕیار، لێرەدا پێویستە بازرگان بەئارام بێت لە بە دەستهێنانی ڕۆزیدا، هەروەها خۆڕاگربێت لە بەرانبەر سرووشتی کارەکەیدا، لەتەك کڕیارەکانیدا شێوازی مامەڵەی گونجاو بێت، بەتایبەت لە



کاتی تاوتوێکردنی نرخەکاندا، لێرەدا پێویستە بازرگان، ڕاستگۆو زمانپاراو بێت.

٣- بەگشتی بازرگانیی، گرێبەستێکی دوور، یان نزیک ماوەیە لە نێوان بازرگانو کریاردا، لەم نێوەندەدا بازرگان هەندێجار قازانجو برێجاریش زەرەر دەکات، بازرگانی سەرکەوتوو، ئەو کەسەیە بتوانێت بەرگەی ئەو زیانە بگرێتو هاوکات بە ویستو ئیرادەی بەهێزەوە هەڵسێتەوەو بەردەوام بێت لە سەر کارەکەی؛ چونکی بازرگانیی لەسەر کۆمەڵێك بنەماو سیستەم دارێژراوە؛ بۆئەوەی لە داهاتوودا بازرگانێکی سەرکەوتوو و داهێنەر بیت، جارێك زەرەرو جارێك قازانج بکەیت، پێویستە لەسەر داروپەردووی شکستەوە، سەرکەوتن تۆمار بکەیت.

هەوڵ بدە ئامۆژگاریی بازرگانەکان وەربگریتو تەنها گوێ بۆ ئەکادیمییەکان ڕامەدێرە.

٤- بوونی بوێری بەسە بۆ سەرکەشی: چونکی سەرکەشی، پێویستی بە هێزو کۆششی بەردەوامە، هەروەها قۆستنەوەی هەلیش. پێویستە باش بزانیت، جیاوازیی سەرکەشیی قومارکردن چییە؟ سەرکەشی کاری ڕاستو تاقەتپرووکێنە، قومارکردنیش پەلهاویشتنە بۆ یاساغ (حرام)و چانس.

ویستو هێز لێرەدا زۆر گرنگە؛ چونکی هەموو کەسێك ئامادەیە هەڵە بکات، لێرەدا دەبێت لە هەڵەکانتەوە فێربیتو تاجەگولێنەی سەرکەوتن لە ژێلەمۆی شکستەوە لە ژیانی بازرگانیتدا سەر دەربهێنێت، نەك لاوازیی خۆڕادەستکردن لە بەرانبەر ئەو بارودۆخانەی بەسەرتدا دەگوزەرێن.

سەرکەوتن لە کاری بازرگانیدا کارێکی ئەستەم نییە، بەڵام ئاسانیش نییە، چەندێك لە بەدەستهێنانی ئامانجەکاندا ویستمان بەهێز بێتو لێبڕاوانە کاربکەین، هێندە هەلی سەرکەوتن لە دنیای بازرگانیی لە دەرگای ژیانمان دەدات.

٥- دۆزینەوە بازاڕ: بازرگان دەبێت بە دوای هاوپەیمانێتیدا بگەڕێت لەتەك کۆمپانیاو دامەزراوەکاندا؛ چونکی ئەو هەنگاوە یارمەتیدەری دەبێت، ئامانجە کەسییەکانی بگۆڕێت بۆ ئامانجی دامەزراوەیی، لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك بکەیتو باش بیربکەیتەوە؛ تا بزانیت لەتەك کام دامەزراوەدا، هاوپەیمانی درووست دەکەیتو کام جۆری بازرگانی دەکەیت بە پیشەت.

٦- ڕێکخستنی کات: بۆ تەواوکردنی گشت کارێك، یان ئەرکێك، پێویستی بە کاتی دیاریکراوە، با دەستپێکی کارەکەت لە هەوڵی بەدەستهێنانی گوژمەی نەختینەدا بێت، دواتر بە کاری قازانجکردن، سەرکەوتنی بازرگانیی، پەیوەستە بە هەستکردن بە هەستو نەستی کڕیکارانەوە، ئەو کارە هۆکارە بۆئەوەی خەڵك ڕوو لە دامەزراوەو بەرهەمەکانت بکەن.

٧- ئامانج: ئامانجی بازرگان دیارە، ئەو دەزانێت چی دەوێت، ئەو دەتوانێت ئەو بەرهەمە دیاری بکات، کە مەبەستییەتی لە بازاڕدا بیخاتە ڕوو، لێرەدا دەبێت، ماوەی جێبەجێکردنی لە لایەن کۆمپانیاکەوە دیاری بکرێت؛ چونکە ئەگەر لە کاتی دیاریکراودا بەرهەمو خزمەتگوزارییەکانت پیشان نەدا، یاخود دابین نەکرد؛ ئەوا کۆمپانیاکەت یەکێکە لە کۆمپانیا شکستخواردووەکان.

# شەکرفرۆش

محمد قازی

جارێکیان شەکرفرۆشێك، شەکرەکەی بە هەمان نرخی خۆی؛ دەفرۆشتەوەو ڕۆژانە زیاتر لە بیست گونییە (فەردە) شەکری دەفرۆشت، لە کاتێکدا دوکاندارەکانی تر، کەمتریان دەفرۆشت.. جارێکیان فرۆشیارەکانی تر چوون بۆلایو پێیان گوت: باشە، تۆ چ قازانجێك دەکەیت لەو فرۆشتنە، کە بە هەمان نرخی خۆی دەفرۆشییەوە؟ خۆ تۆ پارە ناگۆڕیتەوە؟ ئەویش گوتی: ڕاستە من شەکرەکە بە هەمان نرخی خۆی دەفرۆشمەوە، بەڵام من پارەم لە گوێنییەکەی دەست دەکەوێت، کە دانەی بە دینارێك دەدەمو ڕۆژانە بە لای کەم، بیست دینارم هەیە کە کەستان ئەو پارەیەتان لە شەکرفرۆشتنی ڕۆژێك دەست ناکەوێت...

***لەم چیرۆکەوە، ئەوە فێر دەبین، کە دەتوانین بە بیرۆکەکانمان زۆر شت بەدەست بهێنین، لەبەرئەوە تکایە چرای عەقڵت مەکوژێنەرەوە، هەر بیرۆکەیەکت هەبوو سەرەتا بینووسە، دواتر هەنگاوی بۆ بنێو دڵنیابە خۆت نەبیت، کەس ناتوانێت کپت بکات.

درووست وەك ئەو مریشکفرۆشەی کە مریشکەکانی بە نرخی مایەکەی ئەفرۆشێتەوە، تەنها نرخی سەربڕینو پاککردنی مریشکەکان وەردەگرێت..



# سەرکەوتن، یان شکست لە ٩٠ ڕۆژی یەکەمدا



و: نانا هەورامی

## نووسینی لیستو بانگهێشت

تێبینی: لە کۆتایی ناسینەکەدا، شتێکی بە نرخ لە لای ئەو کەسە بە ئەمانەت دابنێ، تا بۆ وەرگرتنەوەی، بەدواداچوون بۆ ئەو کەسە بکەیت.

پێشتر وتمان، نابێت لەبارەی ئەو کەسانەی کە بانگهێشت دەکرێن، پێشداوەری بکەیت. پێویستە هەموو کەسێك بانگهێشتی کارەکە بکەیت. هەر کە کەسەکان هاتنە ناو کارەکەوە، دەتوانیت دەستەبەندییان بکەیت.

لە دەستپێکی کاری **NM** پێویستە وەك ماسیگرێك ڕەفتار بکەیت: تۆڕەکە فڕێ بدەرە ناو ئاوەکەوەو ماسییەکی زۆر ڕاو بکە. دەستەبەندیو هەڵسەنگاندن دواتر ئەنجام بدە. ماسییەکان یەك یەکو بە قولاپ ڕاو نەکەیت. هەروەها تۆ بە ناونیشانی یەك تازەکار لە **NM** پێویستە تا ئەو جێگایەی دەتوانیت، بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەیتو چاودێریی بکەیتو دابەشکردنی ژێر لقەکان بۆ کەسانی جۆراوجۆر دواتر ئەنجام بدەیت.

بەم حاڵەوە، توێژینەوە ئەوەی سەلماندووە، کە دەتوانرێت کۆمەڵە سازانی بەهێز لە کەسانی تر جیا بکرێتەوە. بە پشتبەستن بە ئەزموونی تایبەتی خودی خۆت، کەسانی کۆمەڵە سازانی بەهێز، خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەن:

١- ئەو کەسانەی کە لە کار، یان پیشەکەی خۆیاندا سەرکەوتوون.. ئەم جۆرە کەسانە خاوەنی ڕوانینو ڕێکخستنێکن کە پێویستیی سەرکەوتنە. ئەم جۆرە کەسانەش ئێستا لە کارەکەیاندا سەرکەوتوونو شێوازێکی بەرزو پێشکەوتوو لە ناخیاندا جێگیر بووە، تەنها ئەوە بەسە کە کۆمەکیان بکەیت، هەتا وزەو سوودەکانی **NM** درك بکەیت.

٢- کەسانی ڕەخنەگر..

ئەمانە کەسانێکن کە بەهۆی پێگەو پلەکەیانەوە، لەناو خەڵکیدا ڕەخنە دەگرن. بەم حاڵەوە، پەسەندکردنو تێگەیاندنی بازرگانی **NM** بەم جۆرە کەسانە زۆر ئاسان نابێت. هەروەها ئەم جۆرە کەسانە، بۆئەوەی کە سەرکەوتوو بن، پێویستە گۆڕانکارییەکی گەورە لە بۆچوونی خۆیاندا بەدی بهێنن. ئەوان ناچارن لە کەسانێکەوە شتێك فێر ببن، کە لەوانەیە بە ئەندازەی خۆیان سەرکەوتوو نەبن. لەبەر ئەوە لەوانەیە ئەم جۆرە کەسانە، لە قۆناغی سەرەتادا، لە ڕاکێشانی کەسەکاندا سەرکەوتوو بن، بەڵام ئەگەر نەتوانن بۆچوونی ڕوونو شێوەگەلی ئوصوڵی کاری **NM** لە ئەندامانی گرووپەکەیاندا، هاوشێوەسازی بکەن(**duplicate**)، لە کۆتاییدا کۆمەڵەکەیان دەوەستێت. لەگەڵ هەموو ئەم وەسفانەدا، ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە حەزیان بە فێربوونو گۆڕانکاری هەبێت، ئەگەری سەرکەوتنیان زۆر زیاترە.

٣- کەسانی"کراوە"..

ئەم جۆرە کەسانە، لە هەموو جێگایەکدا دۆستو ئاشنایان هەیە. لەگەڵ هەموو کەسێکدا گونجاونو لە دروستکردنی پەیوەندیدا، لێهاتووییەکی زۆر بەرزیان هەیە. خەڵکیان خۆش دەوێتو جێگای ڕێزی نزیکەکانی خۆیانن. گەر هەلێکی کار بەدرووستی بەم جۆرە کەسانە بناسێنرێت، کۆمەڵەسازێکی زۆر باش دەبن.

٤- ئەو کەسانەی کە"تینوو"ی هەلێکن..

ئەمانە کەسانێکن کە خەونگەلی گەورەیان لە سەردا هەیە، هەمیشە لێرەو لەوێ، بەدوای هەلێکەوەن؛ تا بارودۆخی خۆیان باشتر بکەن. ئەم جۆرە کەسانە حەزیان بە تێکۆشانە. ئەم جۆرە کەسانە، ئەگەر بۆچوونێکی باش لەبارەی کارەکەوە پەیدا بکەنو بەباشی فێربن، بەشێکن لە کۆمەڵەسازە بەهێزەکان.

٥-کەسانی بەئەزموون لە **NM**..

ئەمانە کەسانێکن کە پێشتر کاریان لە **NM** کردووە. گرنگ نییە ئەمانە پێشتر زۆر سەرکەوتوو بوون، یان نا. ئەم جۆرە کەسانە بەو زانیاریو ئەزموونەی هەیانە، دەتوانن کۆمەڵەسازێکی باش بن.

١- نموونەی دەقی بانگهێشتی تەلەفۆنی

أ. ئاماژە بە کەمی کات: "ببوورە، ئێستا کاتم زۆر نییە، بەڵام تەلەفۆنم کرد، بڵێم کە......"

ب. ناساندنو پێداهەڵدان لە کاتی پێویستدا: "من هەمیشە تۆم بە ناونیشانی مرۆڤێکی......قەبووڵ کردووە."

پ. درکاندن: "نازانم دەتزانی، یان نا، من هەر لێرە بەکارێکی

باشو گەشەسەندووەوە سەرفاڵم."

ت. قسەی کۆتا: "لە ڕاستیدا نازانم توانای ئەم کارەت هەبێت، یان نا، ئەوەی کە بتوانین پێکەوە کار بکەین، یان نا، بەڵام وا بزانم باشتر وایە یەکتری ببینینو تایبەتمەندییەکانی کارەکە بزانیت. ئەو کات دەتوانیت بڕیار بدەیت. هیچ گەرەنتییەك ناکەم، بەڵام باشتر وایە پێکەوە قسە بکەین."

ج: کۆتایی": "من کاتژمێر.....و.......کاتم هەیە. کامیان بۆت دەگونجێت؟"

چ: بیانووەکانو وەڵامی چارەساز..

- ئەم کارە چییە؟

سەیربکە، دڵنیام پرسیاری زۆرت هەیە، من ئەمڕۆ تەنها تەلەفۆنم کرد، بزانم ئایا کاتت هەیە بێیت لەبارەی ئەوەوە قسە بکەینو زانیاری زیاتر وەربگریت (لێرەدا وادەکە دیاری بکە).

ئەگەر پێداگرییان کرد، دەتوانیت بڵێیت: "سەیرکە.....وەك ئەوەی ئەو کەسەی کە دەمویست تۆ نیت. باشتر وایە بابەتە لەبیر بکەیت. من خۆم یەکێك- دوهەفتەی تر، ئەگەر هەر هێشتا کەسێکم پێویست بێت پەیوەندیت پێوە دەکەم- دەتدۆزمەوە."

"سەیرکە.....پێت خۆشە هەندێك بەڵگەو پەڕاوت بۆ دەنێرمو دوای ئەوەی کە خوێندتەوە تەلەفۆن دەکەمو بڕیاری کۆتایی دەدەین؟ ئەڵبەتە ئەگەر هەتا ئەو کاتە کارەکەم دەستی پێ نەکردبێت."

- زۆر سەرقاڵم..

"دەزانم چی دەڵێیت....، بەڵام ئەم کارە لە ڕاستیدا بۆ ئەو کەسانە گونجاوە کە سەرقاڵن. ئێمە لە کارەکەماندا چەمکێکمان هەیە بە ناوی بەرزکردنەوەی کات، کە هەرچی بەرەو پێشتر دەڕۆین، لە کاتماندا زیاتر دەست پێوەگری دەکرێت."

یان بڵێن:

"بە دڵنیاییەوە منیش دەمزانی کە سەرقاڵیت....، بەڵام ئێمە لەکارەکەماندا سوود لە چەمکێك بەناوی بەرزکەرەوەی کات وەردەگرین کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کارەکە بۆ ئەو کەسانەی کە سەرقاڵن گونجاو بێت."

- ئەم کارەی کە دەیڵێیت، فرۆشتنی ڕاستەوخۆ/ بازاڕسازیی چەند لایی، یان نێتۆرکی مارکێتینگە؟

"ئەم کارە لە فرۆشتنی ڕاستەوخۆ/...../.......باشترە."

"ئەو کارەی کە ئێمە دەیکەین، لە نێتۆرکی مارکێتینگی صەرف فراوانترە. ئێمە سیستمێکی سنووردار بە تاکمان هەیە، کە باشترە پێش ئەوەی کە بڕیارێك بدەیت لەبارەیەوە، بیر بکەیتەوە."

"سڵاو.....من......م. حاڵت چۆنە؟ گوێ بگرە، من کاتێکی زۆرم بۆ قسەکردن نییە. تەلەفۆنم کرد چەند شتێکت پێ بڵێم. لە ڕاستیدا بۆ بەدەستهێنانی داهات بیرۆکەیەکی باش بە بیرمدا هاتووە، ئەگەر پارەکەی باش بێتو لەگەڵ کاتی تۆدا بگونجێت، ئامادەیت هاوکاری بکەیت؟"

ئەو کەسەش دەڵێت: "لەوانەیە. ئێستا دەکرێت ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەیت؟"

"ئەڵبەتە کە دەکرێت. وادەیەك دابنێینو لەبارەیەوە قسە بکەین. فلان ڕۆژ/شەو کاتت چۆنە؟.....زۆر باشە،.... دەتبینم. ئێستا خوات لەگەڵ!"

(وادە دانان لەگەڵ سەرۆکەکانتدا)..

"سڵاو...حاڵت باشە؟ من......م. بۆ ئەوە کاتم گرتوون کە دەمەوێت بڵێم یەکێك لە هاوڕێکانم بە کارێکی داراییەوە سەرقاڵە، کە زۆریش دەستی دەگرێت. لەم هەفتەیەدا فلان ڕۆژ دێتە ئێرە.... بەم شێوەیە.. نابێت ڕوونکردنەوە بدەم، بەڵام هەر ئەمە بڵێم، کە داهاتو سەربەشییەکی باشی هەیەو من حەزم لەم کارە کردووە. هاوڕێکەم بە دوای ژمارەیەك کەسی گونجاوی ئەم کارەدا دەگەڕا، منیش تۆم کەوتەوە بیر. چۆنە یەکتری ببینین و........ئەڵبەتە هیچ بەڵێنێکت پێ نادەم، تەنها یەکتری ببینین."

"سڵاو، من......م. باشی؟.......گوێ بگرە، نازانم کۆتا جار کە پێکەوە قسەمان کرد، پێم وتی کە کارێکی بازرگانیم هەیە، یان نا........ کۆمپانیایەکی گەورە خەریکی کارکردنە. یەکێك لە هاوکارەکانم فلان ڕۆژ دێت، بۆ ماڵمان. کارەکەی زۆری دەوێت؛ چونکە بەباشی پێش دەڕوات. بەدوای یەك هەتا دوو کەسی گونجاودا دەگەڕێین بۆ هاوکاری. بزانم، پێت خۆشە داهاتێکی زیادەت هەبێت، یان لەکاری ئێستات ڕازیت؟"

"ڕاستیت بوێت، دڵنیانیم کە بتوانیت مەرجەکانی ئەم کارە بەجێ بهێنیت، یان نا. تەنانەت ناشزانم کە ئایا دەتوانین پێکەوە کاربکەین، یان نا.. بەڵام خۆشحاڵ دەبم دابنیشینو لەبارەیەوە قسە بکەین، پێکەوەو بزانین چی دەبێت."

(بە ئەمانەتدانانی کاسێت، ڤیدیۆ،CD، یان کتێب لەلای ئەو کەسەی کە بانگهێشتی دەکەین.)

"سڵاو، من.........م. ئەمشەو لەماڵیت؟ دەمویست شتێکت بۆ بهێنم. (ئەو شتە چییە؟)ئێستا دەیهێنم ببینیت."

کاتێك دەڕۆیت بۆ ماڵیان:

".........دەمەوێت گوێ لەم کاسێتە بگریت/ئەم فیلمە ببینیت/ ئەم کتێبە بخوێنیتەوە. لەبارەی کارێکە. پارەکەی خراپ نییە.پێم خۆش بوو بە تۆش بڵێم. سبەینێ دێم وەری دەگرمەوە لێت."

دواتر بۆ بانگهێشتو دانانی وادەی یەکدی بینین تەلەفۆن بکەن:

"بەڵام ئەم هەفتەیە لەگەڵ هاوڕێکانمدا، یەك دوو کۆبوونەوەمان هەیە کە لەبارەی ئەو کاسێت/فیلم/کتێبەیە، کە بە ئەمانەت پێم دایت، قسەیان لەبارەیانەوە دەکەین. پێم خۆشە تۆو هاوسەرەکەت لە یەکێك لەو کۆبوونەوانەدا هەبن. کام ڕۆژە بۆت باشترە،......یان......؟"

ئەو بیانووانەی کە لەوانەیە ئەو کەسانە بیانهێننەوە، کاتێك کە بانگهێشتیان دەکەین.

-کەی پێویستە هاوسەرەکەشم بێت؟

"لە سرووشتدا تۆ بەبێ ئامادەبوون/ڕاوێژ لەگەڵ هاوسەرەکەتدا بڕیاری هیچ کارێك نادەن..."

- کاتم نەبوو کتێبەکە بخوێنمەوە/ گوێ لە کاسێتەکە بگرم/ CD ببینم..

"کێشە نییە، وادەیەکی تر دادەنێین. لە ئێستاوە هەتا ئەو کاتە کاتێکی زۆرت هەیە کە سەیرێکی بکەیت. چۆنە؟"

- هەربیانوویەکی تر.

"بابەتەکە، باسی کارێکە کە داهاتێکی باشی هەیەو مەبەستی من ئەوە بوو، کە ئەم بابەتە لەگەڵ تۆدا بخەمە بەرباس. ئەگەر حەز بکەیت، ئەمە باشە... ئەگەریش نا، کێشە نییە. باشە، ڕات چییە؟ هەڵبەتە پێش ئەوەی کە بڵێیت بەڵێ، یان نا، ئامۆژگاریت دەکەم کە زانیاریی زیاتر بە دەست بهێنیت."



بڕیاری منداڵان

پەیام



# ئیدی هەرگیز سەرپێچی فەرمانەکانت ناکەم!

شارا منداڵێکی ژیرو هۆشمەندو گوێڕایەڵ بوو، دایكو باوكو كەسوكاری زۆر خۆشیان دەویست؛ چونکە زۆر عاقڵو ڕۆحسووكو زیرەك بوو، هەرگیز سەرپێچی قسەی دایكو باوکی نەدەکرد، ئەوان هەرچیان بگوتایە؛ دەستبەجێ دەیگوت بە چاوان بابەگیان، دایەگیان، هاوکات برایەکی هەبوو ناوی دانا بوو، منداڵێکی سەرکەشو بێگوێو هاروهاج بوو، هەمیشە دراوسێکانیان سکاڵایان لە دەستی دەکرد، هەر ڕۆژەو شەڕی لەگەڵ یەکێکیان دەکردو ئازاری دەدان، هیچ کات گوێرایەڵیی فەرمانی دایكو باوکی نەدەبوو، هەرچەند ئامۆژگارییان دەکرد؛ وەری نەدەگرتو عاقڵ نەدەبوو، دایكو باوکی هەراسان کردبوو، گوێی بە فەرمانو قسەکانیان نەدەدا

ڕۆژێکیان دایکی داناو شارا، بە نیاز بوو بڕوات بۆ بازاڕ؛ بۆ کڕینی پێداویستییەکانی ناوماڵ، ڕووی کردە کوڕو کچەکەیو پێی گوتن: ڕۆڵەکانم من دەڕۆم بۆ بازاڕ، زۆرم پێ ناچێت، دەگەڕێمەوە.. تکایە کەستان لە ماڵ نەچنە دەرەوە؛ تا دەگەڕێمەوە!

شارا گوتی: بەچاوان دایەگیان.. دانا گوتی: بەڵام من دەمەوێت بڕۆم بۆ یاریگا، تا لەگەڵ هاوڕێکانم یاری بکەم!

دایکی گوتی: کوڕی شیرینم، چاوەڕێ بکە، تا دەگەڕێمەوە؛ چونکە تۆ بە تەنها نازانیت بڕۆیت بۆ یاریگا!

پاشان دایکی بەڕێ کەوت بۆ بازاڕ، پاش کەمێك شارا گوێی لە دەنگی کردنەوەی دەرگاکە بوو، بەخێرایی ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە، بینی وا دانای برای تۆپەکەی هەڵگرتووەو لە ماڵ چووەتە دەرەوە.

شارا گوتی: تکایە بگەڕێرەوە، تۆ بە تەنها ڕێگە نازانیت!

دانا وەڵامی دایەوەو گوتی: نەخێر، من شارەزای ڕێگە هەم، پێش ئەوەی دایکم لە بازاڕ بگەڕێتەوە، من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ!

ئیدی دانا بەرەو یاریگا بەڕێ کەوت، بەڵام لەبەرئەوەی یاریگا دوور بوو لە ماڵیانەوە، دوای ئەوەی دوورکەوتەوە لە ماڵ، ڕێگاکەی لێ تێکچوو، بەشێوەیەك نەدەیزانی بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، نە دەیتوانی بڕوات بۆ یاریگا، لەو کاتەدا کوڕێکی قەڵەوی گەورە، لەوسەری گەڕەك دەرکەوت، لێی نزیك بوویەوەو گوتی: بچکۆل ئەو تۆپەم پێ بدە.. دانا گوتی: تۆپی خۆمە، خۆ هی تۆ نییە بۆ بیدەم بە تۆ!

کوڕەکەش زللەیەکی لێداو بە زۆر تۆپەکەی لێسەندو گوتی: بەڵام ئێستا ئەم تۆپە هی منە، نەك تۆ!

دانا دەستی کرد بە گریانو نەیدەزانی چی بکاتو ڕوو لە کوێ بکات، لەبەر خۆیەوە دەیگوت: خۆزگە بە گوێی دایکمم بکردباو نەهاتمایەتە دەرەوە! ئێستا من چۆن بگەڕێمەوە بۆ ماڵ، لەو کاتانەدا دایکی گەڕابوویەوە ماڵو شارا پێی گوتبوو، کە دانا ڕۆیشتووە بۆ یاریگاو بە قسەی نەکردووم، دایکیشی بەهەڵەداوانو بەپەرۆشەوە بەڕێ کەوت؛ تا هەواڵی بزانێت، دوای ماندووبوونێکی زۆر، لە کۆڵانێکدا بە دانا دەگاتو دەبینێت دانیشتووەو بەکوڵ دەگری، کاتێك چاوی بە دایکی دەکەوێت بەڕاکردن بەرەو ڕوی دەڕواتو باوەشی پێدا دەکاتو داوای لێبوردنی لێ دەکات! دایکی دەڵێت: کوڕم دانا بۆچی لێرەیت، تۆ لێرە چی دەکەیت؟

ئیدی داناش ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو زۆر داوای لێبوردنی لێ دەکاتو دەڵێت: بەڵێن بێت ئیدی هەرگیز سەرپێچی فەرمانەکانت نەکەم دایەگیان!

بەو هیوایەی چیرۆکی دانا، پەندو ئامۆژگاری بێت بۆ هەموو منداڵە چاوگەشەکانو هەرگیز سەرپێچی فەرمانی دایكو باوکیان نەکەن!



# شیردانی دایك بە کۆرپەکەی


ن: د. حسان شمسی پاشا

و: یەحیا موحەممەد عەلی


### ١- شیری دایك:

شیری دایك دیاریی پەروەردگارە بۆ ئەو میوانە نوێیەی هاتۆتە سەر زەویی، خودای گەورە لە لەشی دایکدا، چەندین کارگەی ئامادەکردووە بۆ درووستکردنی ئەم شیرە، کە هەرچی کارگەی دنیایە، ناتوانن هاوشێوەکەی درووست بکەن، ئەم شیرە هەموو پێداویستییەکانی منداڵەکەی تێدایە لە پاراستن (بەرگریی)و خۆراك.. هەروەك هەستێك دەداتە دایکەکە کە پەیوەستبوونی لەگەڵ کۆرپەکەی زیاتر دەبێت. جێگای داخە خەریکە ئافرەتانی ئێمەش چاو لە ئافرەتانی ڕۆژئاوا دەکەنو شیری درووستکراو بەکار دەهێننو شیرپێدانی سرووشتی بە شوێنکەوتنی کەلتووری کۆن دەزانن. بێخەبەر لەوەی ئێستا پزیشکانی ئەورووپاو ئەمریکا هاواریان لێهەستاوەو هەموویان بەیەك دەنگ دەڵێن: (شیرپێدانی دایك باشترینە)!

سەرەڕای ئەو پێشکەوتنەی بواری پزیشکیی بەخۆیەوە بینیوە، کەچی تا ئێستا نەتوانراوە، بەهیچ جۆرێك شیرێك درووست بکرێت جێگرەوەی شیری دایك بێت، بۆ نموونە لەشیری دایکدا زیاد لە سەد ئەنزیم هەیە، کەلە شیری دەستکرددا نییە، هەروەها شیری دایك پاراستنی بەرگریی وای تێدایە، لە هیچ سەرچاوەیەکی خۆراکیی تردا نییە.

ئەمەش وای لە ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانیی (WHO) کردووە، داوا بکەن زۆر گرنگیی بدرێت بە شیرپێدانی سرووشتیی بۆ کۆرپەتازە لەدایکبووەکان، لەبەر ئەو ڕۆڵە گرنگەی هەیەتی لە پاراستنی ژیانیانو چاککردنی باری تەندرووستییان. هەروەها جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی تا تەمەنی (شەش مانگ) جگە لە شیری دایك، هیچ خۆراكو شلەمەنییەکیان پێ نەدرێت، ئینجا بەردوام بن لەسەر شیری دایك، تاکوو (دوو ساڵی)، هاوڕێ لەگەڵ پێدانی خۆراکی ئاسایی، ڕاستترین وتەش فەرموودەی پەروەردگارە: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾ البقرة: ٢٣٣ واتە: (دایکان دوو ساڵی تەواو شیری خۆیان دەدەنە منداڵەکانیان، ئەمە بۆ کەسێك بیەوێت بەتەواویی کاتی دیاریکراوی شیرپێدان تەواوبکات).

### ٢- سوودەکانی شیرپێدانی دایك:

ڕێکخرواى (WHO) زۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر شیرپێدانی دایك، هەر لە یەکەم کاژێری هاتنە دنیای منداڵەکەوە، هەروەها شیرپێدانی هەرکاتێك ویستی لەسەری بوو، دوورکەوتنەوە لە شیرپێدانی دەستکرد، لەبەرئەوەی شیری دایك دەوڵەمەندە بەچەندیین جۆری ڤیتامینەکانو کانزاکان کە منداڵ لە شەش مانگی یەکەم پێویستییەتی، هەروەك دەوڵەمەندیشە بەو ماددانەی بەرگریی منداڵەکە بەهێز دەکاتو دەیپارێزێت لە نەخۆشییەکان. لەبەرامبەریشدا شیرە دەستکردەکان ئەو ماددانەی تێدا نییە کە منداڵەکە لە نەخۆشیی دەپارێزن، بەکارهێنانیشی چەند مەترسییەکی هەیە، لەوانە: ڕەنگە ئەو ئاوەی پێی ئامادە دەکرێت، یان بوتڵە شووشەکە پاك نەبێت، هەروەها منداڵەکە ماددە خۆراکییەکانی بەبڕی یەکسانو ڕێکخراو دەست ناکەوێت، وەك لەوەی کە لە شیری دایکدا هەیە، ئەمەش تووشی بەدخۆراکییو بەدهەرسیی دەکات.

لەبەر ئەمەیە (WHO) هانی ئەوە دەدات دایکەکە لە منداڵەکەیەوە نزیك بێتو شوێنی گونجاویان بۆ ئامادە بکرێت بۆ شیردان بەمنداڵەکانیان لە شوێنی کارەکانیان، بۆ ئەوەی بەڕێكو پێکیی شیریان پێ بدرێت، ئەگەریش هەرنەکرا، ڕێگای گونجاو بگیرێتە بەر لە کۆگاکردنی شیری دایکەکەو پێدانی بەمنداڵەکە لە کاتی پێویستدا.

بەپێی ئامارەکانی (WHO)، دەکرێت لە ڕێی شیرپێدانی دایکەوە، نزیکەی ملیۆنێك منداڵ لە مردن ڕزگار بکرێت لە شەش مانگی یەکەمدا.

شیرپێدانی دایك، چەندین سوودی هەیە بۆ منداڵەکەو دایکەکە، هەندێك لە سوودەکانی لە شەش مانگی یەکەمو هەندێکی بۆ درێژایی تەمەنو هەندێکیشیان لە ماوەی کاتی شیرپێدانەکەدایە.

#### أ- سوودەکانی بۆ منداڵەکە:

* پاراستنی منداڵەکەیە لە نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرسو هەناسەدان لەڕێی درووستکردنی چینێکی بەرگریی لە دەمو لوتو قوڕگو ڕیخۆڵە، هەروەها پاراستنی لە هەوکردنی گوێچکەکان.

* دەیپارێزێت لە هەستیاریی (حەساسیەت)ی کۆئەندامی هەناسەدان.

* تواناکانی مێشكو زیرەکیی چالاك دەکات: ئەمەش بەهۆی ئەو پەیوەندییە سۆزدارییەی لە نێوان دایكو کۆرپەکەدا درووست دەبێت، هەروەها بەهۆی ئەو ترشەچەوریی(Fatty Acid)انەی تێیدایە، دەماخی منداڵەکە زووتر گەشە دەکاتو چالاکتر دەبێت.

* منداڵەکە دەپارێزێت لە قەڵەویی.

* دەیانپارێزێت لە (شێرپەنجەی خوێن، جۆری یەکەمی شەکرە، بەرزەگوشاری خوێن، بەرزبوونەوەی چەوریی خوێن).

#### ب- سوودەکانی بۆ دایکەکە:

* دەبێتە هۆی زوو دابەزاندنی کێشی دایکەکەو گەڕاندنەوەی بۆ کێشی ئاسایی.

* ئەگەری تووشبوون بە چەند جۆرێکی شێرپەنجە کەم دەکاتەوە، وەك (مەمكو هێلکەدان).

* دەیانپارێزێت لەلاوازبوونو زووشکانی ئێسك.

* هاوکاریی دەکات لە زوو کرژبوونەوەی منداڵدانو گەڕانەوەی بۆ قەبارەی ئاسایی خۆی.

# بۆ ئەوەی لە خەمۆکی بەدووربیت، ئەمانە بخۆ..!

توێژینەوە نوێیەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کاتێك کەسێك تووشی خەمۆکی دەبێتو هەستی بێزاریو دڵەڕاوکێی زیادی کرد، دەتوانێت بەخواردنی هەندێ خواردن، باری دەروونی ئاسایی بکاتەوەو میزاجی باش بکات، ئەوەش یەکێکە لە جێگرەوەکانی ڕێگەی بەرکاهێنانی چارەسەری کیمیایی، دکتۆر"جاری وینك" مامۆستای زانستی دەروونیو دەمار لە زانکۆی ئۆهایۆو دانەری کتێبی «مێشکت لە خۆراکتدایە» دەڵێت: خۆراك بریتییە لە چەند ماددەیەکی کیمیایی لێکچووی ئەو ماددەیەی لە مێشکماندایە، کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر بیرو هۆشمان هەیە، هەروەها وینك ئاماژە بۆ ئەو هۆکارە دەکات، ئالوودەی جۆرەخواردنێك دەبین هاوشێوەی ئەوەی کەسێك کە ئالوودەی ماددەی بێهۆشکەر دەبێت.

لە توێژینەوەیەکی تری نوێدا جەخت لەوە دەکاتەوە ٥٠٪ی ئەوانەی تووشی خەمۆکی دەبن، ئەوانەن کە ئالوودەی ژەمەخۆراکییە خێراکانن، شارەزایانی خۆراك، چەند خۆراکێکیان پێ باشە کە یارمەتیی دەرن بۆ تەندرووستییەکی باشو دەروونێکی ئارام، ئەوانیش:

١. قاوە: لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ساڵی ٢٠١١ کراوەو لە گۆڤاری زانستی پزیشکی هەناو بڵاوکراوەتەوە، باس لەوە کراوە خواردنەوەی چوار کوپ قاوە، یان زیاتر لە ڕۆژێکدا، یارمەتی کەمکردنەوەی مەترسی تووشبوون بە خەمۆکی بەڕێژەی ٢٠٪ دەدات، ئەمەش بۆ بوونی ماددەی کافایین دەگەڕێتەوە لە قاوەدا، هەروەها لە توانایدا هەیە دەردانی ماددەی «سیرتۆنینو دۆمبامین» چالاك بکات، ئەو مادانەش بەشێوەی ئاوێتەنو لە دروستکردنی ئەو حەبو دەرمانانەدا بەکار دێن، کە پێویستن بۆ تووشبووانی خەمۆکی.

٢. چەرەسات: چەرەسات یەکێکە لەو خواردنانەی بە ترشی ئەمینی تربتۆفان دەوڵەمەندە، تربتۆفان یارمەتی بەرهەمهێنانی سیرتۆنینی دژەخەمۆکی دەدات، «لیزا دی فایزۆ» پسپۆڕی خۆراکیی باوەڕپێکراوی ئەمریکی دەڵێت: ڕۆژانە خواردنی ٣٠ گرام لە چەرەسات، کار لەسەر مانەوەی بڕی پێویست لە ترشی ئەمینی تربتۆفان دەکات، پاقلەی سۆدانی، گازۆ، بستە، بادام، گوێزو بندوق، زۆرترین بڕی تربتۆفانی تێدایە.

٣. میوەو سەوزە پرتەقاڵییەکان: بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەیەی لەساڵی ٢٠١٣ لە گۆڤاری دەروون پزیشکیدا بڵاو کراوەتەوە، ئەو کەسانەی زۆر گەشبینن، ڕێژەیەکی زۆری کارۆتینیان بە ڕێژەی ١٣٪ لە خوێندا هەیە، کارۆتین یەکێکە لەو دژەئۆکسیدانەی کە لە پەتاتەی شیرینو گێزەردا هەیە، هەروەها لە کولەکەو بیبەردا هەیە.

٤. نیسك: لەساڵی ٢٠١٢ لە ژاپۆن لێکۆڵینەوەیەك ئەنجام درا، بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیە خوادرنی ٢٤٠ مایکرۆگرام لە فولات مەترسی تووشبوون بە خەمۆکی بەڕێژەی ٧٨٪ کەم دەکاتەوە، ئەو ڤیتامینەش بە بڕی ٣٥٨ مایکرۆگرام نیسکی لێنراو لە کوپێکدا هەیە، هەروەها نزیکەی ١٣٤ مایکرۆگرام (نیوکوپ) لە هیلیۆنی لێنراو،و ١٦١مایکرۆگرام (کوپێك) لە نۆکی شامی.

٥. شکۆلاتە: لێکۆڵینەوەیەکی بەریتانی جەخت لەوە دەکاتەوە، ئەو کەسانەی ڕۆژانە بۆ ماوەی مانگێك گیراوەی شکۆلاتەیان خواردووەتەوە، کەسانی زۆر گەشبینو هێمن بوون، زیاتر لەوانەی کە نەیانخواردووەتەوە، ئەمەش بۆ بوونی جۆرەکانی فینۆلات کە دژە ئۆکسیدە دەگەڕێتەوە، بڕێکی زۆر لە شکۆلاتەدا هەیە، ئەو کەسانەی کێشیان زۆرەو نایخۆن، دەتوانن شکۆلاتەی ڕەش کە یەکەی گەرمی نزمە بخۆن.

س: پێگەی فوائد



### بۆ کوڕو کچە لاوەکانم

مۆمی ٤٨

# خواستە باڵاکان

و: ئاسیا سەلاح

لەلای گەنجانمان، بەلاوو خانمانەوە، خواستی هاوبەشی گەورە هەن، کە ئەویش پێکهێنانی خێزانێکی پابەندو سەرکەوتوو و خۆشەویستە، ئەم خواستە باڵایە لە سرووشتو پێکهاتەی پیاوو ئافرەتەوە سەرچاوەی گرتووە، کاتێك سەیری ڕووخساری هەردووکیان دەکەین، دەبینین پیاو بۆ ئەوە درووست بووە، لەگەڵ ئافرەتدا بژی، هەروەها ئافرەتیش بۆ ئەوە درووست کراوە، کە لەگەڵ پیاودا بژی، هەروەها هەریەك لەوانە هاودەنگیو ئارامیو چاودێری بۆ ئەوی دیکە فەراهەم دەکات، کە خۆشیو ئاسوودەیی بۆ ژیانی ئەوی تر دابین دەکات. ڕۆڵەکانم، من وا هەست دەکەم ئەو لاوەی پشتی کردووەتە هاوسەرگیری، یان گوێی پێ نادات، هەروەها ئەو خانمەی کە نایەوێت ببێت بە کابانێکی ماڵو دایکێکی باش، هەردووکیان کەسێتییان کەموکوڕییەکی تێدا دەبێت، تەنانەت من پێم وایە کە مرۆڤ دوای هاوسەرگیری، کەسێتییەکی نوێ بەخۆیەوە دەبینێت؛ چونکە هەندێك هەستو تێگەیشتن تێیدا پەرە دەسەنێت بە هۆی گۆڕانی تێڕوانینی بۆ ژیان.

خۆتان تێبینی ئەو هەستکردن بە لێپرسراویەتییە بکەن، کە دایکو باوکتان هەیانە بەرامبەر یەکو خێزانەکەیان، هەروەها بڕواننە ئەو گیانی قوربانی، لێبوردن، بەرگەگرتن، پێکەوە هەڵکردن، سازان، دەست بەرداربوون، لە ئەستۆگرتن، یارمەتیدان، بەزەییو هاوخەمییەی کە تێیاندایە، هەموو ئەم خەسڵەتانە لە دایکانو باوکاندا، کامڵترو چالاکترە لەچاو ئەو کچو کوڕانەی هاوسەرگیرییان نەکردووە، هەروەها دەبێت دوو شتی زۆر گرنگ لەیاد نەکەین کە ئەوانیش:

خۆپاراستنی دەروون لە لادانو چاوگرتن لە سەیرکردنی حەرام، هەمووشتان فەرموودەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەزانن کە دەفەرموێت: "ئەی گەنجەکان، ئەوەی دەتوانێت هاوسەرگیری بکات، با ئەنجامی بدات؛ چونکە بۆ چاو پارێزەرەو بۆ داوێنیش پاکترە، ئەوەش کە نەیتوانی با بەڕۆژوو بێت؛ چونکە ئەوە بۆ ئەو پارێزەرە لە گوناهکردن".

ئەم فەرموودەیە بانگەوازێکی ئاشکرایە بۆ هاوسەرگیریو ئەنجامدانی لە تەمەنێکی گەنجیدا، جا لەوە جوانتر هەیە کە مرۆڤ بە گەنجی وەچە بخاتەوە، دڵی پێ خۆش بکاتو منداڵەکانیشی بەویستی خوا بۆ ماوەیەکی زۆر دڵیانی پێخۆش بکەن، جگە لەوەش باوانی گەنج باشتر لە هەستو خواستی منداڵەکانیان دەگەنو بەتواناترن لە پەروەدەکردنو فێرکردنیاندا.

تێرکردنی هەستو سۆزی دایکایەتیو باوکایەتی کە خوای گەورە لە سرووشتی ئافرەتو پیاواندا درووستی کردووە، لە بەرهەمە پیرۆزەکانی هاوسەرگیری منداڵە، کە خۆشیی ژیانو خوای گەورە بەهۆی ئەوانەوە، هیوای مرۆڤ گەورەتر دەکاتو زیاتر بەرچاوڕۆشنی دەکات بۆ داهاتوو، جگەلەوەی ڕۆڵە چاکەکان، هەردەم دەبنە چاکەیەکی بەردەوام بۆ باوانیان، کە بەهۆی ئەوانەوە هاتوونەتەوە دنیاوە.

لەوانەیە لێم بپرسن: چی بکەین بۆ ئەوەی خۆمان ئامادە بکەین بۆ بنیاتنانی خێزانێکی دیندارو پەسەندو خۆشەویست؟

منیش دەڵێم: ئەو ئامانجە پێویستی زۆرەو لە هەموویان گرنگتر سێ شتە: دانانی بابەتی هاوسەرگیریو پێکهێنانی خێزان لە پلانەکانی داهاتوی کوڕانو کچاندا، ئەمەش مانای وایە کاتێك دەخوێنن دەبێت لە خۆیان بپرسن: کەی هاوسەرگیری دەکەن؟ ئایا دەتوانن سەرکەوتوو بن لە نێوان هاوسەرگیریو خوێندندا؟ چۆن ئەوە ئەنجام بدەن؟ یاخود هاوسەرگیری پاش تەواوکردنی خوێندن بێت؟ ئەم بابەتە بۆ کچەکان زۆر گرنگە؛ چونکە لەوانەیە یەکێکیان پسپۆڕییەك هەڵببژێرێت، کاتێکی زۆری بوێت، تا تەواوی دەکات، هەروەها لەوانەیە بچێت بۆ خوێندنی باڵاو تا لە سی ساڵی تێپەڕ نەکات، تەواو نەبێت، لەو کاتەدا بژاردەی سنووردارە، کە وای لێدەکات ناچار بێت بە هاوسەرێك ڕازی بێت لە ئاست خۆیدا نەبێت.

بەپێی ئەزموونی تایبەتی خۆم، بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر پارە هەبێت؛ ئەوا هاوسەرگیری ڕێگە ناگرێت لە خوێندن، بەتایبەتی ئەگەر کاتەکان ڕێك بخرێن بەباشی، پێویستە لەسەر کچەکان کە ئەگەر قۆناغی ئامادەییان تەواو کرد، گرنکی بدات بە هاوسەرگیری، ئەگەر نەتوانێت خوێندنو هاوسەرگیری پێکەوە گرێ بدات، دواتر دەتوانێت لە زانکۆیەکی کراوەدا، یان بە شێوازی دیکە بخوێنێت..

با ئایینو ڕەوشت گرنگترین شت بن کە کوڕانو کچان عەودالی بن؛ چونکە سەرەکیترین پایەن بۆ بەردەوامیی ژیانی هاوسەرگیریی، هەندێك لە کچو کوڕەکانمان، پایەکانی ئایین بەجێ دەهێننو گوناهی گەورەش ناکەن، بەڵام خووی ئادەمیانەیان ناخۆشەو هەڵسوکەوتێکی ڕەقیان هەیە، هەندێکیش ڕەفتارشیرینو خەسڵەتی جوانیان تێدایە، بەڵام زۆر زیادەڕەوی دەکەن لە ئەرکەکانداو بۆ هەندێك قەدەغەکراویش ئاسان دەیگرن، هەردوو جۆرەکە ئەوانە نین، کە بتوانیت ژیانیان لەگەڵدا بەسەر ببەیت؛ چونکە ئایین، یان ڕەوشتیان تێدا نییە، زۆربەی کێشەکانی ئەمڕۆش کە خێزانەکان هەیانە، هۆکارەکەی، یان لاوازییە لە لایەنی ئایینەوە، یاخود کەموکوڕییە لە ڕەوشتدا.

خۆتان بە چاوی خۆتان کێشەی هاوسەرەکان دەبینینو زۆری ژمارەی جیابوونەوەکانیش تێبینی دەکەن، هۆکارەکەی ئەو ڕۆشنبیری جیهانگیرییە کە باس لە سەربەخۆیی کەسی دەکاتو بڵاوی دەکرێتەوە، بانگەشە بۆ خۆپەرستی، چێژوەرگرتن، ڕابواردنو کات بەسەربردن دەکات، ئەو بانگەشانەش دژ بە هۆکارەکانی پێکەوەژیانو بەزەیین لە نێوان هاوسەرەکاندا، هەروەها دژ بە بنەماکانی بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەری ئاسوودەن، بۆیە ڕۆڵەکانم هەر یەك لە ئێوە هەوڵ بدات، کە دەوڵەمەند بێت بە ڕۆشنبیرییەکی باشی ئەوتۆ، کە یارمەتی بدات ببێتە ئەندامێکی ناوازە لە خێزانێکی ناوازەدا، ئەوەش لە ڕێگەی زانینی دابونەریتەکانی ژیانی خێزانیو ئەرکەکانی، زانینی مەرجەکانی خۆشگوزەرانی خێزانی، هەروەها دەبێت بەماوەیەکی تەواو بەر لە هاوسەرگیریکردن، لە ڕووی دەروونیو ڕۆشنبیرییەوە ئامادە بێت بۆ پەروەرەی منداڵ، بە کوڕو کچەوە.

بەتواناترین مرۆڤ، کە بتوانێت مرۆڤێکی تر دڵخۆش بکات، یان ژیانی تاڵ بکات هاوسەرە، پاشان دەبێت وشیار بیت، سەبارەت بە بنەماکانی ژیانی هاوسەرگیری سەرکەوتوو، چوونە ژێر باری پێداویستییەکانییەوە. هەرچی هاوسەرگیریی گەنجەکانە، کە بەبێ خۆئامادەکردنی باش پێك هاتووە، ئاکامەکەی جیابوونەوەی زووە، ئەوەش لە لێکۆڵینەوەکاندا ئاماژەیان پێدراوە، کە زۆربەی جیابوونەوەکان لە چوار ساڵی یەکەمی ژیانی هاوسەرگیریدا ڕوو دەدەن.

# ئەوەی لە بەردەستدایە، چێژی لێوەربگرە

و: چیمەن لەتیف

نەریتێکی کۆنم هەیەو خووم پێوە گرتووە، بووە بە بەرنامەی ژیانم. لە هیچ شتێك ناڕوانم هی خۆم نەبێت، ئارەزووی شتێك ناکەم، نەتوانم ببم بە خاوەنی. هەمیشە پۆشاکێك لەبەر دەکەم پڕ بە بەرم بێت، چێژ لەو قەڵەمبازە وەرناگرم بۆ ماوەیەك بەرزم دەکاتەوەو وەحەوام دەخات، پاشان دەمگەڕێنێتەوە سەر دۆخی ئاساییم.

ئای کە بێزارم لەو هەڤاڵەم دەچوو قەرزی دەکردو ئۆتۆمبێلیی دەکری، بارێکی دەدا وەکوڵ خۆیو خانەوادەکەیدا، کە پێیان هەڵنەگیرێت. بە هەرەشەوە پێم دەگوت: براله لە کەولی خۆتدا بژی، چێژ لەو شتە وەربگرە کە ماڵی تۆیە، بەشێوەیەکی ئاسایی تا پێنج ساڵ، بەر لە ئێستا نەتدەتوانی سەیارەی لەم جۆرە بکریت. بۆ شێوە ژیانێك هەڵدەبژێریت جاریٚ وەختی نەهاتووە.

وەختایەك لە دەوروبەر دەنوارم، دەبینم لەم ڕۆژگارەدا زۆربەی خەلقوڵلا بە هەنگاوێك، یان چەند شەقاوێك پێشبڕکێی تواناکانیان دەکەن...

قەرز بە هەموو جۆرەکانییەوە، کارتی ڤیزا، قەرزدانەوە بە ژمەی دوورمەودا، کارێکیان بەسەر هێناوین گشتمان قەرزاربین، جۆرێك لە خۆشگوزەرانی ناڵۆژیکی خولقاندووە، ئێستا بکرەو پاشان نرخەکەی بدە.

ڕۆژێك یاداشتی دەسەڵاتدارێکم دەخوێندەوە، کارێکی ئەو دەستڕۆیشتووە کە وردبینیو دووربینی تێدابوو سەرنجی ڕاکێشام، ڕۆژێکیان کوڕەکەی بە چەپڵەلێدانو هاوارکردنەوە، خۆی کرد بە ماڵدا، باوە مژدەم بەریٚ، کوڕەکە گوتی: خورمایەکم لە بازاڕدا دۆزیوەتەوە کیلۆی بە دینارێکە، بە فرۆشیارەکەم گوت: پووشیٚ لەو خورمایەم بۆ بدە لاوە، تا نرخەکەیت لە ماڵەوە بۆدەهێنم، پیرەدانا لەسەرخۆ خەنییەوەو گوتی: ئەوە دوودینار برۆ دووکیلۆ خورما بکڕە! بە سەرسوڕمانو بیٚ ڕەخنەگرتن کوڕەکە گوێی بۆ بابی ڕادێرا.

ڕۆژگارێك گوزەرا، تا بۆ دووەم کەڕەت، باوکە کوڕەکەی بانگ کردو پێی گوت: ئەوڕۆ لە بازاڕ خورما کیلۆی بە چەندە؟ باوە کیلۆی بە پێنج دینارە. باوکە گوتی: ئەوە پارەو برۆ پووشیٚ خورما بکڕە، دواتر دراوەکەی ویٚ دا.

کوڕەکە بەسەرسوڕمانەوە لە بابی پرسی: بۆچی خورما کیلۆی بە دینارێك بوو نەتدەکری، بەڵام ئێستا کیلۆی بووە بە پێنج دینار پووشێك دەکریت؟!

باوکە لە وەڵامدا گوتی: کوڕی خۆم، ئەوکات دارایی من تەنها دوو دیناربوو، بەڵام ئێستا خاوەنی زۆرم.

گەورەترین ستراتیژ، کە خاوەن ئاوەزەکان جێبەجێی دەکەن، بریتییە لە ستراتیژی (بێمنەتی)، گەر حەزت لە شتێك کردو توانات بەسەریدا نەشکا، لە هزرو دڵی خۆت دەری بکە. تەنها بەم شێوەیە دەتوانیت بەسەر جادوو ئارەزووی خاوەندارێتیدا زاڵبیت.. بەڵام کەوتنە شوێنی بەردەوامت بۆ شتێك، ناتوانیت پەسنی نەکەیتو وا دەکات بەردەوام لەدڵەڕاوکێدا بیت. بەشێکی زۆری تەرکیزت دەبات، لە هەمووی خراپتر، وا دەکات جوانیو دڵڕفێنیی ئەو شتانە نەبینیت، کە لە بەردەستتدان.

ئێمە ناتوانین هەرشت ئارەزوومان لێبوو، ببین بەخاوەنی لە داهاتوودا، زۆر شت هەنە دڵو ڕۆح ئاسوودە دەکەن.

لێرەدا دەبێت ئێمە بە چاوی ڕەزامەندیو ڤایلبوونەوە، تەواشای بەخشراوەکانی پەروەردگار بکەین، کە وەك نیعمەتێك پێی بەخشیووین، پەی بەوە ببەین ئەوەی هەمانە خواستو ئارەزووی زۆربەی خەڵکە. ئێمە نیعمەتێکی زۆری خودامان لە بەردەستدایە، بەڵام هەستی پیٚ ناکەین، یان شتێك لەبارەیانەوە نازانین.

عومەری کوڕی خەتاب، کاتێك دنیا لە دەستیدابوو "دەسەڵاتداربوو، توانای بەسەر زۆر شتدا دەشکاو دەستی پیٚ ڕادەگەیشت" ئارەزووی خواردنێکی دەکرد، نرخەکەی درهەمێك بوو، ساڵێك ئەو خواردنەی لە نەفسی گرتەوە "نەیخوارد"؛ تا بیسەلمێنێت ئەوە نەفسی عومەری کوڕی خەتابە!





# ئایا کەسێکی سەرڕاستیت؟

بۆئەوەی پلەی سەرڕاستیو درووستی خۆت بزانیت، بەوردیو درووستی، وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە.. گەر لە ئەنجامدا لە سەرراستان بوویت، پیرۆزت بێت، ئەگەر پلەکەت کەمتر بوو لە گرووپی سەرڕاستتان؛ ئەوا هەوڵ بدە خۆت چاك بكەیتو كۆشش بكە؛ تا ببیتە ئەندامی گرووپی سەرڕاستان..

١- ئەگەر برێك پارە، یان جزدانێكی پڕلەدراو، یاخود جانتایەكت دۆزییەوە، ئایا دەیگەیێنیتە لایەنی پەیوەندیدار؛ تا لەوێوە بگاتە دەستی خاوەنەكەی؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٢- ئەگەر پۆستێكت بۆ هاتو هی تۆ نەبوو، ئایا دەیگێڕیتەوە بۆ پۆستەو گەیاندن؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٣- ئەگەر كەسێكت بینی لەسەر كارەكەت گیرفانبڕ بوو، ڕاپۆرتی لەسەر دەنووسیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٤- ئەگەر دووكاندار، یان ئەو كەسەی كەلوپەلی لێ دەكڕیت، باقی دایتەوەو زیاتر بوو لە مافی خۆت بۆی دەگێڕیتەوە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٥- ئەگەر پەنجەرەیەك، یان هەر شتێكت شكاند، دانی پێدا دەنێیت، كە تۆ ئەو كارەت كردووە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٦- كاتێك هاوڕێیەكت قسەیەكی ناڕاست دەكات، ئایا پشتگیری دەكەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٧- ئەگەر لە پاركینگێكداو كاتێك ئۆتۆمبێلەكەت ڕادەگریت، لە ئۆتۆمبێلێكت دا، خاوەنەكەی تێدا نییە، ئایا دانی پێدا دەنێیت، كە تۆ لێت یاوە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٨- ئایا هەندێك لە ئاماژەكان فەرامۆش دەكەیت، وەك ئاگاداربە، نزیكی ئەم ناوچەیە مەكەرەوە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

٩- ئایا هیچ كات فێڵت لە باجو دەرامەت كردووەو ویستبێتت خۆت لە باجدان بدزیتەوە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٠- ئەگەر ڕۆژێك نەچوویتە سەركارەكەت، بانگەشەی ئەوە دەكەیت كە نەخۆش بوویت، بۆیە نەچوویتە سەر كار؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١١- ئایا لە پێناوی بەرژەوەندیی كارگەكەت هیچ كات درۆت كردووە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا زۆرجار درۆت كردووە بە بیانووی ئەوەی ئەوە درۆی سپییەو كێشەی نییە؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٣- ئایا زۆرجار خۆت وەها نیشان دەدەیت كە دەوڵەمەندتریت لەوەی كە هەیت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٤- ئایا هیچ كات بووە شتێكت بێ پرسی خاوەنەكەی بردبێت؟ أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

١٥- ئایا ڕێگە دەدەیت كە هاوڕێكەت سزا بدرێت، لەسەر تاوانێك كە لە ڕاستیدا تۆ ئەنجامت داوە؟

أ- بەڵێ. ب- نازانم. ج- نەخێر.

خاڵەكان: لە ژمارە(١-٧) بۆ وەڵامی (بەڵێ ٢ خاڵو نازانم ١ خاڵو نەخێر سفر)دابنێ.

لە ژمارە(٨-١٥) بۆ وەڵامی (بەڵێ سفرو نازانم یەك خاڵو نەخێر ٢ خاڵ)دابنێ.

ئەنجام:

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (٢٦ - ٣٠) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی لە ڕادەبەدەبەر سەرڕاستو ڕاستگۆیت.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (٢٢ - ٢٥) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی زۆر سەرڕاستو ڕاستگۆیت.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (١٨ - ٢١) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی زۆرتر مەیلت بە لای ڕاستگۆییو سەرڕاستیدا هەیە.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (١٣ - ١٧) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی هاوسەنگی.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (٩- ١٢) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی تاڕادەیەك سەرڕاست نیت.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (٥ - ٨) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی فێڵبازیت.

* ئەگەر كۆی خاڵەكانت (٠ - ٤) خاڵ بوو؛ ئەوا تۆ كەسێكی زۆر فێڵبازی.

# هەنگاوێك بۆ پێشەوە

زاهیر زانا

گەورەیـــی ژیـــان، لە توانـــای گۆڕانکاریو گەشەســـەندندایەو گەورەیـــی مرۆڤیـــش لەوەدایە، ئەنجامـــدەری ئـــەو گۆڕانکاریو داهێنانانەبێت، پێوستمان پێیەتی؛ بۆئەوەی لەگەڵ ژیاندا بڕۆینو بەگوێرەی پێویســـتیو ویســـتەکانمان گۆڕانـــکاریو نوێبوونەوەو داهێنانی نوێ بهێنینە ئاراوە کە ببێتە مایەی ســـوودو کەڵك بۆ خۆمانو خەڵکی، هەر وەك چۆن پێداویستیی مرۆڤایەتی بۆ خێرا گەیشتن، ئۆتۆمبێلو فڕۆکەی داهێنا، بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی کۆمپیوتەرو بۆ ڕووناککردنەوەو گەشەپێدانی کۆمەڵێ لایەنی ژیان وزەکانی کارەباو نەوت و...هتد خســـتە گـــەڕ، ئەمانەش هەمووی بەرئەنجامی بەگەڕخستنی وزەی مرۆیی بوونو ئەو کەسانەی کە لێبڕاوانە ویســـتوویانە داهێنانو تازەگـــەری بکەنو خەونەکانیان بکەنە ڕاستی، یاخود بەسەر ئاستەنگەکانی ژیانیاندا سەر بکەون، لە کۆتاییدا گەیشـــتوونەتە مەنزڵو ســـەلماندوویانە کە وزەیەك بەمرۆڤ بەخشـــراوە، لـــە توانایدایە هەمیشـــە هەنگاوێك بچێتە پێشـــەوەو بگرە بازی گـــەورە بداتو داهاتووی ڕۆشـــنتر بکاتەوە لەڕێگای زیادکردنی شـــتێکی تازە بۆ شـــتێك کە پێشتر هەبووە، یاخود دۆزینەوەو داهێنانی شتێکی نوێ.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکان، مرۆڤ لە منداڵیدا توانای داهێنانکاری بەڕێژەیەکـــی بەرز تێدایە، بەڵام لەگەڵ گەورەبوونو تەڵقینکردنی لەلایـــەن دەوروبەرەوە ئەم بەهرەیە کەمتـــر دەکرێتەوە، لەجیاتی ئەوەی گەشەی پێ بدرێتو سوودی لێ وەربگیرێت، بۆیە پێویستە ئێمە چاوەکانمان بشـــۆینو هەمیشە بەوردی ســـەرنجی دەوروبەر بدەینو هەردەم بڕوای پتەومان بەتوانای داهێنانی خۆمان هەبێت، ئـــەو بیرۆکەو ئایدیایانەی دێنە بیرو هۆشـــمانەوە، فەرامۆشـــیان نەکەیـــن؛ چونکە ڕەنگە ئەوانە دەرفەتێکی زێڕینبنو ژیانی ئێمەو ئەوانیتریش بگۆڕن، بیرمان نەچێت، تەنها دروستکردنی شتێکی خڕی شـــێوەی (تایـــە) وەرچەرخانێکی مێژوویی گـــەورەی لەژیانی مرۆڤایەتیـــدا هێنایـــە ئـــاراوەو بووە ســـەرەتا بۆ دروســـتکردنی عەرەبانەو ئۆتۆمبێلو شەمەندەفەر...

بەرێزان گۆڕانو داهێنانکاری سەرەتا لەخودی خۆمانەوە دەست پێ دەکات، بەوەی هەمیشە بەیانیمان لە ئەمڕۆ باشتربێتو کاتێك زانیاریو ڕەوشتو هەڵسوکەوتمان بەرەو باشتر دەچێت نرخو قەدرو ڕێزیشـــمان زیـــاد دەکاتو بونمان مانادارترو ژیانمان پرشـــنگدارتر دەبێـــت؛ چونکە هەرکەس بەپێی ئاســـتی زانینەکەی ژیانی خۆیو دەوروبەری ڕۆشـــن دەکاتەوە، کاتێك باسی داهێنان دەکەین، نابێت وا بزانین تەنها دروســـتکردنی کەشتی ئاســـمانییە، بەڵکو لە شتە بچووکەکانەوەو بیرۆکە ســـادەکانەوە دەست پێ دەکاتو وردە وردە گەورە دەبێتو گەشـــە دەکات، بەڵام پێویستە ئێمە بۆ ئەوە هەنگاو هەڵبگریـــن، دەگێڕنەوە: جارێك زانایەکیان بانگ کردبوو قســـە بۆ خەڵکی بکاتو ئامۆژگاری پێشـــکەش بکات، کاتێك گەیشـــتە شوێنی وتاردان، ئەو کەسەی کۆڕەکەی پێشکەش دەکرد، کاتێك بینی شوێن کەمە، داوای لەئامادەبوان کرد هەر کەسەو هەنگاوێك بێتە پێشەوە، پاشان چووە لای زاناکەو گوتی فەرموو دەست پێ بکە، زاناکە گوتی: بەڵام تۆ هەموو قسەکانی منت کرد؛ چونکە منیش تەنها دەمویست بڵێم"یەك هەنگاو لەژیانتاندا وەرنە پێشەوە".

ئازیزان، ئەو وزەیـــەی ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ گۆڕانکاریو داهێنان بەرهەمی گـــەورەی دەبێتو گۆڕانکاری لەژیانی خۆمانو دەوروبەرماندا دروســـت دەکات، بـــە گۆڕینی یەك کیلۆ گەنم بۆ ئـــارد، نرخەکـــەیو بەکارهێنانەکەی زۆر دەگۆڕێـــت، ئەی ئەگەر هەمـــان کیلۆ بکەین بەنان، یان برمـــەو پاقلاوە، یاخود جۆرێکی تری شـــیرینی، بێگومانین لەوەی نرخەکەی چەند بەرامبەر زیاد دەکات، بـــەڵام زۆرن ئەوانـــەی تەنها لەیەك قاڵبـــدا دەمێننەوەو بچووکترین جووڵەش بۆ داهێنانو گەشەو گۆڕانکاریو نوێبوونەوە ناکـــەن.. ئەوەتا مارك توین دەڵێت: (ئەگەر تۆ کارەکەت بەهەمان شێواز ئەنجام دەدەیت، کەچەند ساڵە ئەنجامت داوە، بزانە تۆ بۆ ئەو کارە نابیتو بۆ کارێکی نوێ بگەڕێ).

بـــەو هیوایەی گیانـــی داهێنانکاریو نوێبوونـــەوە لەخۆماندا گەشـــە پێ بدەیـــنو بەجۆرێك بژین کە ســـبەینێمان هەمیشـــە لە ئەمڕۆ باشـــتربێت، لەبـــەر ئەوەی بەیـــان وەك ئەمڕۆ نییەو ڕۆژێکـــی جیـــاوازەو بەروارێکی نوێیە، ئێمـــەش بەچاوێکی نوێو بە بەرنامەیەکی جیاوازو وزەیەکی نوێوە، پێشـــوازی لێ بکەینو هەمیشە ئامادەی ڕاوکردنی بیرۆکەی نوێ بین، کە زۆرجار لەناو گرفتەکانـــدا خۆیان مـــەڵاس داوە، بەدۆزینەوەشـــیان دەرگایەکی نوێمان بە ڕوودا دەکرێتەوە.



# ژاپۆنییەکان هەرگیز پاشەکەوت ناکەن!

ئـەوەی کە ژاپۆنی کردووە بە ژاپۆنـی ئیمپراتۆری ئابووریو پێشکەوتنو تەکنەلۆژیا، شـتێکی ڕێکەوت نییە. بەڵکوو ئەنجامی هەوڵو چاکسازیی تاکو کۆمەڵگاو حکومەتە. لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر ئێمەش بمانەوێت، دەتوانین هەر هیچ نەبێت، لەسەر ئاستی تایبەتـیو تاك بگەین بەوان.. چون هیچ شـتێك ئاسـتەم نییەو بـۆ هەموو شـتێك ڕێگایەك بوونی هەیە. ئـەو ڕێگایەش هەوڵو پێداگـریو بەردەوامـیو کۆڵنەدان درووسـتی دەکاتو دەیهێنێتە بوون...

- ژاپۆنییەکان هەرگیز پاشەکەوت ناکەن!
- هەڵئاوسـانە ئابوورییـەکان لە ژاپۆندا، یان ئاسـایین، یان سفرن!
- لە ژاپۆندا ماڵی ڤێلایی زۆر بەدەگمەن هەیە!
- مردن لەسەر کار لە ژاپۆندا شانازییە!
- مووچەی مانگێکی مامۆستا ٧٥٠٠ دۆلاری ئەمریکییە!
- شکستخواردن لە کارەکەیدا بۆ بەڕێوەبەرێك بەرامبەری مەرگە!
- هەمـوو مامۆسـتاکانی قۆناغـی بنەڕەتـی ئافرەتـن، کـە زۆرینەیان ئەوەندەی دایکی منداڵەکان دڵسۆزن!
- قوتابییەکان ئەوەندە خۆشەویسـتییان بۆ قوتابخانە هەیە، لە کاتی پشوودا دەست دەکەن بە گریان!
- زۆرینەی ژنان لە ژاپۆندا دوای هاوسەرگیریی، ئیتر کار ناکەن!
- پیاوان مووچەکەی خۆیان دەدەنە دەسـتی هاوسەرەکانیانو داوای پارە لەوان دەکەن!
- هەتـا پۆلی سـێی بنەڕەتی تاقیکردنەوەیـان نییە. هەتا ٩ بنەڕەتی شـتێکیان نییە بەناوی دەرنەچـوون؛ چونکە ئامانجیان پەروەردەو بونیادنانی کەسایەتی نەوەکانیانە، نەك تەنها فێرکردن.
- ڕۆژانـە قوتابیـان لەگـەڵ مامۆسـتاکانیاندا بـۆ ماوەی ١٥ خولـەك خەریکی پاككردنـەوەی قوتابخانەکەیانـنو ئەم کارەش دەبێتـە هۆی ئەوەی کە نەوەیەکی لەخۆبوردوو پارێزگاریی پاكو خاوێنی پەروەردە ببێت. هـەر لەبەر ئەوەش کە پاكوخاوێنییان بە یەکەم پلەی ڕەوشت داناوە.
- کرێـکاری پاککـەرەوە، بـە ئەندازیاری تەندرووسـتی ناو دەبەنو مانگانە ٥ هەتا ٨ هەزار دۆلاری ئەمریکی وەردەگرێتو بۆ دەستبەکار بوون لەم پیشەیەدا، پێویستە تاقیکردنەوەی نووسینو زارەکی بکات.
- ژاپۆن هیچ سـەرچاوەیەکی سرووشتی (نەوتو گازو بەردی بە نرخو مس و...)نییە. سـاڵانە دەیـان زەمین لەرزە لێی دەدات، بەڵام ئەمانە نەبوونەتە هۆی ئەوەی کە ئەم وڵاتە لە ڕیزبەندیی زلهێزەکانی ئابووریی جیهان بهێنێتە دەرەوە.
- هێرۆشـیما، تەنهـا لـە ماوەی ١٠ سـاڵدا توانیـی لە ڕووی ئابوورییەوە بگەڕێتەوە بۆ هێرۆشیماکەی پێش بۆمباران.
- بەکارهێنانی تەلەفۆنی مۆبایل لە ڕێستۆرانتو شەمەندەفەرو شوێنە گشتییەکاندا قەدەغەیە. لە بری وشەی(**Silent**)پەنجە بە وشەی (**Switch off**)مۆبایلەکانیاندا دەنێن لەو شوێنانەدا.
- یەکێك لە وانەکانی قۆناغی یەك، هەتا شەشـی سـەرەتایی (هەنگاوێك بەرەو ڕەوشت)ە. کە تێیدا ڕەوشتو شێوەی ڕەفتارکردن لەگەڵ دەوروبەردا فێری فێرخوازان دەکرێت.
- لەگەڵ ئەوەی کە ژاپۆن یەکێکە لە دەوڵەمەندترین وڵاتانی دونیا، بەڵام هەرگیز خزمەتکار ناگرن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان. لەسەر دایكو باوك پێویستە کە بەرپرسیارێتیی ماڵو منداڵەکانیان لەئەستۆ بگرن.
- لە ڕێسـتۆرانتەکاندا هەر کەسەو بەپێی ئەندازەی خواردنی خـۆی خواردن دەهێنێتو لـە کۆتاییدا هیچیان لـێ نامێنێتەوە. واتە: دەستبڵاویو زیادەخەرجی بوونی نییە.
- ماوەی دواکەوتنی گەشـتەکانی شـەمەندەفەر لە سـاڵێکدا تەنها ٧ چرکەیە. بەرپرسانی ئەم بابەتە ساڵانە داوای لێبوردن لە هاوڵاتیانیان دەکەن لەم بارەیەوە. ژاپۆنییەکان خەڵکانێکن کە زۆر گرنگـی بـە کات دەدەنو زۆر بە دیقەتەوە چاودێریی کۆتا هاتنی خولەكو چرکەکان دەکەن.
- فێرخوازان مەعجوونو فڵچەی ددان دەبەن لەگەڵ خۆیاندا بۆ قوتابخانە، بۆ ئەوەی دوای نانخواردن دانیان بشۆن. بەم شێوەیە هەر لە منداڵییەوە فێر دەکرێن کە گرنگی بە تەندرووستی خۆیان بدەن.
- بەڕێوەبەرو مامۆسـتایانی قوتابخانە، نیو کاتژمێر لە پێش قوتابییەکانـەوە لەو خواردنە دەخۆن، کە بۆیان درووسـت کراوە، هەتـا لە گونجاوی خواردنەکەو سـەلامەتی قوتابییەکان دڵنیابن. ئەگـەر پرسـیاریان لێ بکرێت، کـە بۆچی ئـەم کارە دەکەن، لە وەڵامدا دەڵێن: تەندرووسـتیی ئەوان لە ئێمـە گرنگترە؛ چونکە ئەوان ئایندەی ژاپۆنن..



و.لەفارسییەوە:
زریان مەحموود




# هەیاس لە تەمەنی لاویدا

هەیاسی خاس هەر لە منداڵییەوە، بە زیرەکیو بیرتیژیو لێهاتوویی ناسرابوو، خاوەنی حیکمەتو دانایییەکی کەموێنە بوو، زانایانی ئەو سەردەمە، پێشبینیی ئەوەیان کردبوو، کە ئەم منداڵە، واتە: هەیاس ئایندەیەکی گەشو کەسایەتییەکی بەرزو لێهاتووی دەبێت، سەرەنجام هەر بەو شێوەیە بوو، کە زانایان پێشبینیان دەکرد، هەیاس بووە ئەو کەسەی، کە لە هەموو جێگەیەك بە نموونەی زیرەکیو بیرتیژیو لێهاتوویی دەهێنرایەوە، بەتایبەت لە بواری دادوەریو حوکمو قەزاوەتدا، سەرەنجام هەیاس بووە ئەو قازییە کەموێنەیە، کە مێژوو شایەتی لێهاتوویيو زیرەکی بۆ دەدات، دەتوانین بڵێین لە دوای هەیاس، تا ئێستاش هاوشێوەی ئەو قازییە بیرتیژو لێهاتووە، دووبارە نەبۆتەوە.

هەیاس خۆی دەڵێت: هەر مرۆڤێك عەیبو عاری خۆی نەزانێت، کەسێکی گێلو نەزانە، پێیان گوت: ئەی عەیبو عاری تۆ چییە؟ لە وەڵامدا گوتی: زۆر قسەکردن! هەر چەندە هەیاس، جگە لە حەقو ڕاستی قسەی نەدەکرد!

باوکی لە بارەی زیرەکی هەیاسەوە دەڵێت: خەڵکی منداڵیان دەبێت، بەڵام من خودا باوکی پێ بەخشیوم! مەبەستی ئەوەیە کە لە باوکی زیرەکترو لێهاتووترە!

لەم ژمارەیەدا، باس لە هەڵوێستێکی سەردەمی لاوێتیی هەیاس دەکەین لەگەڵ عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا:

هەیاس لە فێربوونی زانستو گەڕان بە دوای زانستدا قاڵ بوو، هەر لە تەمەنی لاوێتیدا، هەموان شایەتی زیرەکیو لێهاتوویيو زانایيان بۆ دەدا، هەیاس لە تەمەندا لاو بوو، بەڵام لە زانستو زانیاریدا، زانایەکی بلیمەتو قسەزان بوو، تەنانەت زۆرێك لە زانایانی ئەو سەردەمە، پرسو ڕاوێژیان پێ دەکرد، متمانەیان بە زانستو زانیاریو بلیمەتیی هەیاس هەبوو، لەسەر دەستی هەیاس، وانەیان دەخوێندو بەپەرۆشەوە گوێیان بۆ ڕادەدێرا، بێئەوەی گوێ بدەنە جیاوازیی تەمەنیان، (زانا گەورەیە، گەرچی کەمتەمەنیش بێت، نەزانیش بچووکە، گەرچی بەساڵاچووش بێت)!

ڕۆژێکیان عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، پێش ئەوەی ببێتە خەلیفە سەردانی شاری بەصرە دەکات، چاوی بە هەیاس دەکەوێت، کە ئەو کات لاوێکی تازە پێگەیشتوو بوو، تەنانەت هێشتا بەتەواوی مووی لێ نەڕوابوو، سەرنجی دا، چوار کەس لە لە زانایانی خوێندنەوەی قورئان، خاوەن سیماو ڕیش، بەجبەو عەمامەوە، لە دوایەوە دەڕۆنو هەیاسی تازەلاویش لە پێشیانەوە دەڕوات!

عەبدول مەلیك گوتی: (ئۆف) بۆ ئەم خاوەن جبەو عەمامانە، لە بری ئەوەی دوای شێخێکی بەئەزموون بکەون، ئەو مێردمنداڵەیان پێش خۆیان داوەو ئێوەش بەو هەموو هەیکەلو کەسایەتییەوە، دوای کەوتوون! دواتر ڕووی کردە هەیاسو گوتی: ها هەرزەکار تەمەنت چەندە؟

هەیاسی ژیرو لێهاتوو زۆر لەسەرخۆ وەڵامی دایەوەو گوتی: جەنابی شازادە، تەمەنم هاوشێوەی تەمەنی ئوسامەی کوڕی زەیدە، ئەو کاتەی پێشەوا (سەلامی خودای لێ بێت) کردی بە سەرکردەی سوپایەك، کە لە ناویدا پێشەوای وەکو ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمام عومەری تێدابوو!

هەیاس بەم وەڵامە شازادەی تووشی شۆك کرد، لەبەرئەوە جەنابی شازادەش، جگە لەوەی کە دان بنێت بە زیرەکیو لێهاتوویی هەیاسدا، ڕێچارەیەکی دیکەی نەبوو، هەر بۆیە گوتی: ئەی لاو بەردەوام بە لە ڕۆیشتنت، خودا بەرەکەت بخاتە تەمەنتەوە!

بەم شێوەیە هەیاسی لاو، توانی بیسەلمێنێت، کەمیی تەمەنی، ڕێگر نییە لەبەردەم ئەوەی ببێتە پێشەواو سەرقافڵەی زانایان، بەڕاستی هەیاس هەر لە منداڵییەوە، خاوەنی زیرەکییەکی بێوێنە بووە!

# وەڵامی بەجێ

• لە دانایەکی دنیاتوویان پرسی: بە چیدا دەزانی کەسێك تۆی خۆش دەوێت؟
ئەویش گوتی: بەوەی خەمم هەڵبگرێت، لێم بپرسێتەوە، لێم بێزار نەبێت، چاو لە هەڵەکانم بپۆشێتو خوداشم بیر بخاتەوە!

• لە پیاوچاکێکیان پرسی: کەسێك دەناسی دوعای گیرا بێت؟
پیاوچاکە گوتی: نا، بەڵام زاتێك دەناسم دوعا گیرا دەکات، سا لەبەرئەوە دڵت بە خوداوە بەند بکە، نەك بە خەڵقی خودا!

• لە کوڕێکیان پرسی: جیاوازیی دایکتو کەسانی دیکە چییە؟
کوڕەکە گوتی: دایکم لە خودا دەخوازێت، باری خەمو خەفەتم، لەبری من هەڵبگرێت، کەچی کەسانی دی، ئاوات دەخوازن بە باری خەمو خەفەتەوە نەمبینن!

• لە مەهاتیر موحەممەدی سەرۆکی پێشووی مالیزیایان پرسی: چۆن مالیزیا، بەو گەشەو پێشکەوتنە بەرچاوەی ئێستە گەیشتووە؟
لە وەڵامدا گوتی: کاتێك ویستمان نوێژ بکەین، ڕوومان کردە مەککە، ئەو کاتەشی ویستمان وڵات بنیات بنێین، ڕوومان کردە یابان!

تاکە بەندیخانەی ڕاستەقینە، بریتییە لە ترس، تاکە ئازادیی ڕاستەقینەش، بریتییە لە ڕزگاربوون لە ترس.

-ئۆنج سان سوکی-چالاکوانی سیاسی-

شکست مەحاڵە.

سۆزان بی ئەنتۆنی -چالاکوانی سیاسی-

هەرگیز نەکەی، بزووتنەوەو کارکردن تێکەڵاو بکەی؛ ئەو دووانە جیاوازن!

هەمەنگوای -نووسەر-

هیوا ئەوە نییە، کە باوەڕت وا بێت، هەموو شتێك باش دەبێت، بەڵكو متمانەیە بەوەی کە هەموو شتێك، مانای خۆی هەیە، بێ گوێدانە ئەنجامەکەی.

فاکلاف هاڤیل -نووسەر-

ئەگەر دەتەوێت هاوڕێ ڕاستەقینەکانت بناسیت، خۆت بخەرە زیندان.

چارلز باکوسکی -نووسەر-

# گۆرانی بلێ بۆ ژیان



# سیستەمی بەرگریی لەش، کۆنترۆڵی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانمان دەکات!

**ئامادەکردنو وەرگێڕانی: ناز سەعید**

لە توێژینەوەیەکی سەرنجڕاکێشدا، سەبارەت بە پرسیاری جەوهەری لەبارەی ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤەوە، توێژەرانی کۆلیژی پزیشکیی زانکۆی (ڤێرجینیا) بۆیان دەرکەوت، کە سیستەمی بەرگریی لەش، ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەیە لەسەر ڕەفتارو هەڵسوکەوتی مرۆڤو تەنانەت کۆنترۆڵی ڕەفتارەکانیشی دەکات، وەك ئارەزووی بۆ بەستنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

ئایا هەبوونی کێشە لە سیستەمی بەرگریی لەشدا، ڕۆڵی هەیە لەوەدا، کە مرۆڤ نەتوانێت بە شێوەی ئاسایی ڕەفتار بکات؟ وەڵامی ئەمە دەکرێت، (بەڵێ) بێت، ئەم دەرەنجامە دەکرێت کاریگەریی گەورەی هەبێت، لەسەر نەخۆشییە دەمارییەکانی وەك ئۆتیزمو شیزۆفرینیا.

(Jonathan Kipnis) سەرۆکی بەشی (تیشکە سەروو وەنەوشەییەکان لە زانستی دەمارناسیدا) لە کۆلیژی پزیشکیی زانکۆی (ڤێرجینیا) دەڵێت: پێشتر وا بیریان دەکردەوە، دەماغو کاری سیستەمی بەرگریی لەش جیاوازنو دوورن لە یەکترەوە، هەر چالاکییەکی بەرگری لە مێشکدا وا لێك دەدرایەوە، کە نیشانەیە بۆ هەبوونی نەخۆشی، بەڵام لە ئێستادا، ئێمە نەك هەر نیشانی دەدەین، ئەو دووانە کاریگەریی زۆریان هەیە لەسەر یەکتر، بەڵکو



ئەوەش دەڵێین کە هەندێك لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانمان لەدەرەنجامی کاردانەوەی سیستمی بەرگریی لەشمانن، بەرامبەر نەخۆشییە بەکتریو ڤایرۆسییەکان.

دەشڵێت "ئەوە سەرشێتییە"، بەڵام لەوە دەچێت ئێمە بریتی بین لە کۆمەڵەخانەیەکی زۆر کە لە مەیدانی جەنگێکی گەورەدان، لە نێوان دوو هێزی کۆندا، کە بریتین لە (نەخۆشییە بەکتریو ڤایرۆسییەکان)و (سیستمی بەرگریی لەش)، لە ڕاستیشدا بەشێك لە کەسایەتیی ئێمە، لەلایەن (سیستمی بەرگریی لەش)مانەوە، فەرمانی بەسەردا دەدرێت!

## هێزو تواناکانی گەشەپێدان لە کاردا

کاتێك کە دکتۆر (Jonathan)و تیمەکەی، ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە سیستمی دەماری، ڕاستەوخۆ مێشك دەبەستێتەوە بە سیستمی لیمفاوییەوە، لەپێشترو لە دەیەی ڕابوردوو لە کتێبە فێرکارییەکاندا، وا هاتبوو کە مێشك پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە سیستمی بەرگرییەوە نییە، بەڵام ئەم دۆزینەوەیە دەرگای ئاوەڵاکرد لەبەردەم ڕێگەیەکی نوێ لە بیرکردنەوەدا سەبارەت بەوەی کە دەماغو سیستمی بەرگری، چۆن کاریگەرییان هەیە لەسەر یەکدی.

ئەم توێژینەوەیە، تیشك دەخاتە سەر کاری دەماغو گەشەسەندنی، پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکانو نەخۆشییەکان وەك توێژەران ئاماژەیان پێدا، دەتوانێت ڕاستەوخۆ کاریگەریی هەبێت لەسەر پەرەپێدانی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانمان، ئەمەش یاریدەمان دەدات بۆ چوونە ناو ئەو کارلێکە کۆمەڵایەتییانەی کە گرنگو پێویستن بۆ مانەوەمان لە کۆمەڵگەدا، لەهەمان کاتدا گەشەکردنی سیستمی بەرگریمان دەمان پارێزێت لە نەخۆشییەکانو هاوتایە لەگەڵ ئەو کارلێکانەدا. کەواتە ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان بە دڵنیاییەوە کاریگەرییان هەیە لەسەر نەخۆشییە بەکترییەکانو دەبنە هۆی بڵاوبوونەوەشیان.

توێژەران ئەوەیان خستە ڕوو، کە بچووکترین گەردی پرۆتین، لە سیتمی بەرگریدا (جینێکی بۆماوەیی) کاریگەریی هەیە لەسەر ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان لە بوونەوەرە جۆراوجۆرەکاندا، بۆ نموونە لە مێشو ماسیو مشکو هتد دا.. لابردنی ئەو جینە بۆماوەییەش لە مێشکی مشکدا، دەبێتە هۆی ئەوەی کەمتر کۆمەڵایەتی بێت، دانانەوەی ئەو جینەش، وا دەکات کە بگەڕێتەوە بۆ دۆخی ئاساییو ڕەفتاری ئاسایی پێشووی.. لە کاتی خستنە ڕوو و بڵاوکردنەوەی ئەم توێژینەوە گرنگەدا، توێژەران ئاماژەیان بەوەدا کە ئەو جینە بەرپرسی بەرگرییە، کاریگەریی قووڵو بەهێزی هەیە لەسەر پاراستنی چالاکییە کۆمەڵایەتییە شیاوەکان ..

دکتۆر (Anthony J. Filiano) کە هاوکاری دکتۆر ((Jonathan Kipnis بوو پێی وابوو، کە ئەوە زۆر پێویستە بۆ بوونەوەرە زیندووەکان کە کۆمەڵایەتی بن؛ تا بتوانن پارێزگاری لە مانەوەی خۆیان بکەن؛ چونکە ئەوە گرنگە بۆ دەستکەوتنی خۆراکو گەشەکردنو زۆربوونیان. بۆیە گریمانەی ئەوەی کە کاتێك زیندەوەران (بوونەوەران بەگشتی بە مرۆڤیشەوە) پێکەوەن؛ ئەوا ئەگەری زۆرتری ڕوودانی کێشەو دوژمنایەتی هەیە لە نێوانیاندا. کەواتە: پێویستە لەسەرت کە کۆمەڵایەتی بیت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەری تووشبوونت بە کێشەو نەخۆشی زیاد دەکات، بیرۆکەکە ئەوەیە کە جینی بەرپرس لە گەشەسەندن زۆر بەتوانایە لە بەکارهێنانی ڕێگەی شیاودا، بۆ پەرەپێدانی ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکانو هاوکات بەهێزکردنی بەرگری دژی نەخۆشییەکانیش.

## تێگەیشتن لە کاریگەرییەکان

توێژەران تێبینی ئەوەیان کرد کە تێکچوونی سیستمی بەرگری، یاخود بوونی هەر کێشەیەك لە سیستمی بەرگری لە لەشدا، لەوانەیە بەرپرس بێت لە کەموکووڕیی کۆمەڵایەتیداو لە نەخۆشییە دەماریو دەروونییەکاندا. بەڵام ئەمە مانای وایە، کە بۆ هەندێك لە نەخۆشییەکانی وەك ئۆتیزمو هەندێك حاڵەتی تایبەتی دیکە، پێویستە زیاتر لێی ورد ببینەوە. ئەوە واتای ئەوە نییە، کە هەر جینێك بەرپرس بێت لە نەخۆشییەکو کلیلیش بێت بۆ چارەسەری. توێژەرەکان بڕوایان وایە، کە هۆکارەکان زۆر زیاتر ئاڵۆزن، بەڵام ئاشکرابوونی ئەوەی کە سیستمی بەرگریو (هاوکات میکرۆبو ڤایرۆسەکانیش)، بەتێپەڕبوونی کات دەکرێت کۆنترۆڵی کارلێکە کۆمەڵایەتییەکانمان بکەن، ئەمە دۆزینەوەی ڕێگەیەکی کاریگەرو گرنگە بۆ زاناکان، کە بتوانن زانیاری زیاتر بدۆزنەوە، لەهەردوو بواری بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییەکانو تێگەیشتن لە ڕەفتارە مرۆییەکاندا.

دکتۆر (Jonathan) دەڵێت: جیناتەکانی بەرگری، لە ڕاستیدا ئەوە دەردەخەن، کە چۆن دەماغ کار دەکات، ئەوەی گرنگو جێگەی بایەخەو پێویستە توێژینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت ئەوەیە، کە ئایا کاریگەریی گشتی سیستمی بەرگری چییە لەسەر گەشەکردنو کارکردنی دەماغو مێشکمان؟ بڕوام وایە جەوهەری فەلسەفی ئەم کارە زۆر سەرنجڕاکێشو کاریگەرە، لەهەمان کاتیشدا شوێنەواری پزیشکیی گرنگیشی هەیە.

سەرچاوە: وێبسایتی زانکۆی ڤێرجینیا



# کاریزما چییە؟

نیگار عەلی

لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە، بە واتای دیاری، یان بەخششی خوایی، زۆرجارپێشی دەڵێن: (جادووی کەسێتی)، یا (هێزی کەسێتی) خاسیەتێکە لە ناخی تاکدا، توانای ڕێبەریکردنی تاکو کۆمەڵگەی هەیە لە باوەڕپێکردنو ئاراستەکردن، هەرئەوەیە کە کەسایەتیی سەرکردەکانو پێشەوا ئاینیو ڕۆحییەکانی پێ جیا دەکرێتەوە.

**ئایا کاریزما بۆماوەییە، یان وەرگیراو؟** زانایانی دەروونناسی، ڕای جیاوازییان هەیە لەسەر ئەم بابەتە هەندێك پێیان وایە، تاك ئەم سیفەتە لە باوانەوە وەردەگرنو (بۆماوەییە)، هەندێکی تر پێیان وایە، نەخێر.. سیفەتێکی (ژینگەییە)، کاتێك تاك لە ژینگەیەکی تەندرووست لەدایك دەبێتو هەموو پێداویستییە دەروونیو کۆمەڵایەتیو......هتد، تێدا بێت دەتوانێت ببێت بە کەسێکی کاریزمی.

**کێ کەسێکی کاریزمییە؟**

کەسێکە لە زاکیرەی خەڵکی بوونی هەیە، لەبیر ناکرێ، گەر خۆشت بوێت، یا ڕقت لێی بێ، ناتوانرێ تواناکانی بشاررێتەوە کاریگەری لەسەر گەلو نەتەوە دروست دەکات، وا لە خەڵکی دەکات، حەز دەکەن کاتی زیاتری لەگەڵ بەسەر بەرن، چاودێری دەکرێ لێیەوە فێر دەبنو کردارەکانی دووبارە دەکەنەوە، کاریگەری دروست دەکات لەسەر هەستو سۆزی خەڵکی، هەتا زۆرجار دەیانگەیەنێتە ئارامیو دڵخوشی، هەروەك چۆن پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر (موحەممەد) (دروودو سڵاوی خودا لێ بێت)، یان زۆر جار دەیانخاتە ئاگروناخۆشی وەك چۆن(هیتلەر) ئەوکارەی کرد، تائێستاش جێگای شانازی گەلەکەیەتی.

**بۆئەوەی ببی بەکەسێکی کاریزمی، پێویستە ئەم خاسیەتانەت تێدابیت: -**

**١-خۆت بناسە:** لە کلیلی کەسێتی خۆت تێ بگە (کارەکانت-کاردانەوەکانت -ئاگاداری زمانی جەستەت بە- دەربڕینەکانت) لە بارودۆخە جیاوازەکان، تێگەشتن لە خۆت هێزو توانات پێ دەبەخشێت بۆ مامەڵەکردن لە دەروونی خۆتو بەوریاییەوە، زیرەکی؛ ئەو وێنەیە (image)بزانیت کە خەڵکی تۆی پێ دەبینن، پێش دانانی کاریگەری لەسەریان.

**٢- ورەیان بەرز بکەرەوە:** هەموومان باوەڕمان وایە، کەسی بەختەوەرو کراوە، کاریگەریی ئەرێنی لەسەر خەڵکی دادەنێت، هەروەها لە سەرئەوەش ڕێکەوتووین، کە کەسی کەمدوو داخراو، خەڵکی لێی دوور دەکەونەوە، ئاسانترین ڕێگەش بۆ بەرزکردنەوەی ورە، وەرزشی بەردەوامە کە حاڵەتی مەزاجیت ڕێك دەخەنو دڵەڕاوکێ کەم دەکاتەوەو تەمەن درێژ دەکات.

**٣- وا بکە لە خەڵکی هەست بە گرنگیی خۆیان بکەن:** دیارە وەك مرۆڤ هەموو کەسێکمان لا گرنگە، کە گرنگیمان پێ دەدات، ئەگەر دەتەوێت خەڵك پێت کاریگەر بن(گوێیان لێ بگرە -بیانناسە- لێیان تێبگە)وا بکە هەست بە گرنگیی خۆی بکات لەو شوێنە.

**٤- گەشە بە بواری ڕۆشنبیریو زانیاری خۆت بدە:** ئەو کەسانەی زۆر زاناو ڕۆشنبیرن خەڵکی پێیان کاریگەرن، هەموو کەس ئەزموونو زانیاری لە بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا هەیە، هەوڵ بدە لایەنی ڕۆشنبیریی خۆت دەوڵەمەند بکە، لەگەڵ خەڵکیدا هاوکاربە بەبیروبۆچوونو گرنگی پێدانت.

**٥- گرنگی بە شێوازی دەرکەوتنت بدە:** دەرکەوتنی ڕوخسارو لەشولار بە شێوەیەکی جوان، زۆر گرنگە بایەخدان بە تەندرووستییو توانای جەستەییو لەشولارێکی ڕێكو ڕێکپۆشی کاریگەریی هەیە، لەسەر تێڕوانینی خەڵکی بۆت؛ چونکە یەکەم نامەیە، کە دەینێری بۆ خەڵك لەسەر کەسێتیی خۆت؛ چونکە دەری دەخات کە تۆ چەندە گرنگی بە خۆت دەدەیتو لە خۆت ڕازیت، ئەو شتە لەبەر بکە، کە لەگەڵ نرخو کەسێتیی تۆدا گونجاوە، بەڵام بە شێوەیەك نا، کە زۆر ماندوو بیت، وا بکەیت کە قەرزارت بکات، یان پارەیەکی زۆر سەرف بکەیت، شتێکی سادە، بەڵام بەتەرتیبو پاكو خاوێن.

**٦- دڵدانەوە:** گوێگرتن بەگرنگییەوە دڵدانەوەی ڕاست، کورتترین ڕێگەیە، کە بمانگەیەنێت بەوەی کە کەسێکی سەرنجڕاکێش بین، تۆ چۆن دەتوانیت کاریگەری لەسەر خەڵك دروست بکەیت کە نەتەوێت، لێیان تێ بگەیت.

**٧- وا بکە بیر لە قسەکانت بکەنەوە:** لە گفتوگۆکردندا نموونەیەك بەکار بهێنە کە (شوبهێنراو بێت)، یان (وێنابۆکراو بێت)؛ چونکە ئەوە لە باشترین ئامرازەکانە، کە وا بکات کە گفتوگۆکەت بەچێژو کاریگەر بێت، وا بکە خەڵکی بیر لە دەربڕینەکانت بکەنەوە، لە ڕووی واتاو دەربڕین، هەموو کات گفتوگۆکانت ڕوونو کراوە بێت بۆ بەرامبەر.

**٨-گرنگی بە ناوی کەسەکان بدە:** هەموو کەس پێویستە گوێی لە ناوی خۆی بێت، بۆیە کاتێك قسە لەگەڵ یەکێك دەکەیت ناوی بهێنە، بەڵام لەگەڵ هەموو ڕستەیەکدا نا، لە سەرەتاو کۆتایی گفتوگۆدا، ناوی کەسی بەرامبەر بهێنە.. ئەمەش وا دەکات کە قسەکانت زۆرترین ڕێزو خۆشەویستی پێوە بێت، زۆر لەمپەری نێوانتان لا دەبات.

**٩- ڕازی بە:** ڕازی بە بەو بەشەی خوا داویەتی پێت، ئەوە کلیلی بەختەوەرییە، خەڵکیش کاریگەرن بەکەسێك کەبەختەوەرەو بەبەشی خۆی ڕازییە.

**١٠-کەسێکی شادیهێنەر بە:** خەڵکی بە سرووشتی خۆیان، مەیلیان بەلای کەسانێك دەچێت، کە خوشمەشرەبن، زەردەخەنە لەسەر لێویانەو خەڵکی دەخەنە پێکەنین، بەڵام لەسەر حسابی کەسانی ترنا، کەسانێك لووتبەرزنو حەزیان بەو شێوازە ژیانە نییە، هەوڵ بدە لە هەر جێیەك بوویت، کەشێکی خۆش بۆ چواردەورت دروست بکەیت.



و: نێچیروان شوانی

# چۆن شکست دەگۆڕێت بە سەرکەوتن؟!

گومانی تێدا نییە، زۆرینە بەو ساتانە تێپەڕیون، کە تێیدا هەست بە شکست دەکەن، جا ئەگەر ئەو هەستە، خەیاڵیش بێت، تەنانەت کاتێك ئەگەر ئەو هەستە دوور لە واقیعیش بێتو تەنیا هەستێکی رووت بێـتو رەنگدانـەوەی راسـتی نەبێت. دەکرێـت کاریگەریی خراپی بەسـەر کەسـەکانەوە هەبێت، جا لـەڕووی دەروونییەوە بێت، یان کۆمەڵایەتی. هەسـتکردن بە شکست بەشێوەیەکی توند، پەیوەسـتە بە کۆی رەفتارو هەڵسـوکەوتی رۆژانـەوە. لێرەدا ئەم هەسـتە لەڕووی دەروونییـەوە، کاریگەریی خۆی جـێ دەهێڵێت، ئەگەر کەسـێك لـە ئەنجامدانی هیـچ کارو چالاکییەکی رۆژانەدا سەرکەوتوو نەبوو، ئەوا هەستی شکست لای دەگۆڕێت بە درککردن بە بێهیوایی‌و ساردبوونەوە. وای لێ دەکات دەستەوەستان بێت لەو هەنگاوانـەی ناویەتـی بۆ ئەنجامدانی کارێك، یـان چەند کارێکی لێکچوو، بەهۆی ئەو شکسـتەی لە راپەڕاندنی کارەکەی پێشووەوە تووشی هاتووە. بەدڵنیاییەوە ئەو کەسەی خۆی بەدەست شکستەوە دەدات، دەبێتە مۆڵگەیەك بۆ ساردبوونەوەو زۆرترین ئامادەیی تێدا دەبێت بۆ تووشـبوونی بە نەخۆشـی دەروونی‌و ئەقڵی. ئەو کەسە بەجۆرێك بیر دەکاتەوە، کە لە هەموو هەڵسـوکەوتێك دەترسێت؛ چونکە وا هەست دەکات، شکست دەهێنێت.

### چۆنییەتی گۆڕینی شکست بە سەرکەوتن

شکست مۆرکی شەرمەزاری نییە، یاخود دێوێك نییە، تا لەبەری هەڵبێیت. هیچ کەسێك نییە، لەسەر رووی زەوی شکستی ئەزموون نەکردبێت، بەڵام لێرەدا ئەوە گرنگە، کێ بڕیار لە شکستو بەرگرتن لە شکسـت دەداتو کێیە ئەوەی سـەرکردایەتی گۆڕینی شکست بۆ سـەرکەوتن دەکات؟ ناوداردارتریـن زانایان بەدرێژایی سـەدەکان. نەگەیشتوون بە داهێنانو دەستکەوتی گەورەیان بەدەست نەهێناوە، مەگـەر دوای چەنـدیـن هەوڵی شکسـتخواردوو و سـەرنەکەوتوو نەبێت، کە سـووربوون لەسـەر کار ئەو هەوڵە سەرنەکەوتووانەی لەبـار بردوون، بـۆ نموونە: تۆماس ئەدیسـۆن، دوای ١٨٠٠ هەوڵی سەرنەکەوتوو، ئینجا سەرکەوتوو بوو لە داهێنانی گڵۆپی کارەبایی.

هەروەها کە تەماشـای ئەبراهـام لینکۆڵن دەکەین، دەبینین ژیانی لەنێـوان شکسـتی کارو سـەرنەکەوتوویی ژیانـی تایبەتیدا بووە. دوای ئـەوەی کۆمەڵێـك ئەزموونـی شکسـتخواردووی تۆمارکرد، بـووە سـەرۆکی ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لـە کاتێکدا تەمەنی لە ٦٠ سـاڵ زیاتر بوو. ئەمەش بەهۆی سـووربوونو ورەو خۆبەدەستەوەنەدانییەوە بوو بۆ شکست. بەم شێوەیە سەبارەت بە ئەزموونی خۆی دەڵێت: (هەرگیز لە کارێکدا شکست ناهێنیت، تەنیا مەگەر ئەو کاتە نەبێت، کە لێی پاشەکشە دەکەیت). لەبەرئەوە وا پێویست دەکات، کەس لە ئەزموونێکی شکستخواردوودا نەگەڕێتەوە دواوەو وازنەهێنێت، بەڵکو هەوڵ بداتو هەوڵ بدات، تا دەگات بە ئاواتی خۆی.

پێویسـتە ئەو کەسە بزانێت، ژیان پڕیەتی لە چاڵ، کە رەنگە بکەوێتـە ناو یەکێکیانەوە، بەڵام تەنیـا کاتێك لێی قوتار دەبێت، کـە دوور بین بێتو لە کاتـی گونجاودا، خۆی رزگار بکاتو درێژە بە ژیانی خۆی بدات، پێویستە گریمانەی ئەوە بکات، کەس نایەت لەو چاڵەدا رزگاری بکات. بۆیە دەبێت ئەو کەسە ببێتە سەرکردەی خـۆی‌و درك بەوە بکات، کە توانای شـیاوی هەیـە بۆ هێنانەدیی سەرکەوتن.

بڕوابوون بە خود، لە گرنگترین ئەو هۆیانەیە، کە یارمەتیدەرە بۆ دەسـتەبەرکردنی سەرکەوتن. پێویسـتە ئەو کەسە، وا مامەڵە لەگـەڵ ئەزموونـە شکسـتخواردووەکانیدا بـکات، کـە وانەیـەك بوونلێیانەوە ئەوە فێر دەبێت، کە ئەو هەوڵانە دووبارە نەکاتەوە، کە بەرەو شکستی بردوونو کار بۆ راستکردنەوەیان بکات، تا دەگات بە سەرکەوتن. پێویسـتە ئەو کەسە ئەزموونە شکستخواردووەکان لـە بارودۆخـی تایبەتی خۆیدا ببینێتو بەهێزی ویسـت(ئیرادە) بەرەنگاری ئەو باردۆخانە بوەسـتێتەوە، کە بەرانبەر بەدیهێنانی ئامانجەکانی وەستاون. لەبەرئەوە وا پێویست دەکات بە تەواوی لە بیرکردنەوە نەرێنییەکان دوور بکەوێتەوە.

سەرچاوە: سایتی تسعة

جەلال عەبدوڵڵا حاجی



# نەوتو ژینگە، کۆمەڵگەو مافی مرۆڤ

## ڕژانو بڵاوبوونەوەی نەوت

### بەشی پێنجەم

ڕژانــی نەوتو پیســکردنی ژینگــە، بەزۆری لــە ئەنجامی کرداری دەرهێنــانو هەناردەکردنی نەوتەوە ڕوو دەدات، بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی لەبارەی ڕژانی نەوت، لەســەر ئاستی جیهانی بڵاو کراونەتەوە، لەنێوان ســاڵانی (١٩٧٨-١٩٩٧)دا، ساڵانە بڕی (٢٠-٤٠) ملیۆن گاڵۆن بووە، ژمارەی ئــەو ڕووداوانەی لەهەمان ماوەدا ڕووی داوە (١٣٦ بۆ ٣٨٢) حاڵەت بووە لەساڵێکدا.

لێچوونــی نەوت لە کۆگاکانی هەڵگرتنی نەوتو بۆڕیو هۆیەکانی گواســتنەوەی نەوتــدا ڕوو دەدات، بەتایبەت تانکەرو شــەمەندەفەری گواســتنەوەی نەوت، ڕاســتە بەشــی زۆری لێچوونەکان بڕەکەی کەمە، بــە بەراورد لەگــەڵ ئەو ڕووداوانــەی کە لە ئەنجامی کەشــتییەکانی گواســتنەوەی نەوتــەوە ڕوو دەدەن، بڕەکــەی لەنێــوان (دە هەزار بۆ ملیۆنێك گاڵۆنە)، لە کاتێکدا کۆی بڕی لێچوونە کەمەکان، دەگاتە (١٥ بۆ ٢٠ ملیۆن گاڵۆن) لە ساڵێکدا، ئەگەر دووبارە بێتەوە، بەهۆی بەرکەوتنی گیانلەبەرانو ڕووەك بە پیسبوونی بەردەوام؛ ئەوا زیانبەخشتر دەبێت، لە ڕووداوی کەشتییەکانی گواستنەوەی نەوت.

ڕژانو بڵاوبوونــەوە گەورەکانی نــەوت، بەهۆی کەشــتییەکانی گواستنەوەی نەوتەوە ڕوو دەدەن، وەك ڕووداوی (پریستج) کە لە ساڵی (٢٠٠٢) دا ڕووی دا، لەسەر کەناراوەکانی باکووری ئیسپانیا، ئەو نەوتەی ڕژایە ژینگەوە، بە بڕی (حەڤدە ملیۆن گاڵۆن) خەمڵێنراوە.

لەســاڵانی(١٩٦٠)دا کەشــتییەکی گواســتنەوەی نــەوت، توانــای گواســتنەوەی نزیکەی (١٥٠) ملیۆن گاڵۆن نەوتی هەبوو، ئێستا کەشتییە زەبەلاحەکانــی نــەوت، فراوانییەکەیــان زۆر زیــادی کــردووە، توانای گواستنەوەی نزیکەی (٢٤٠) ملیۆن گاڵۆنیان هەیە، بەڵام زۆر تووشی ڕووداو دەبن، لەبەرئەوەی گەورەیەو بەئاسانی توانای جووڵەیو پێچکردنەوەی نییە، هەروەها دیزاینو درووســتکردنی نەگونجاو دەبنە هۆی لێچوونی زیاتر لە کاتی ڕووداوەکاندا. ئەو کەشــتییانەی یەك پەیکەرن جووڵەیان ئاســانترە، بــەڵام لە کاتــی ڕووداوەکاندا نەوتی زۆرتریــان لێ دەڕوات، بۆیە بڕیاردرا هەموویان بگۆڕدرێن بۆ کەشــتی جووت پەیکەر. تەمەنی کەشتی هۆکارێکی ســەرەکییە بۆ لێچوونە نەوتییەکان، ئاگرکەوتنەوەو تەقینەوە بەزۆری لە کەشتییە کۆنەکاندا ڕوو دەدات.

ڕژانو لێچوونــە کەمــەکان گرنگــی زۆری پێنادرێــت، لەلایــەن بەرپرســانی حکومی، هۆیەکانی ڕاگەیاندنو ڕای گشتییەوە لەدەرەوەی ناوچە پیس بووەکە، پێویســتە ڕووداوێکی ڕژانو بڵاوبوونەوەی گەورە ڕووبدات، بۆئەوەی بەرپرســان هان بدات، هەنگاو بنێن بۆ گرتنەبەری ڕێوشــوێنی ســەلامەتی، لەگەڵ دانانی بەرنامە بــۆ بەرەنگاربوونەوەی لێچوونە نەوتییــەکان، بۆ نموونە لە وڵاتــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە پاش ڕووداوی (ئیکســۆن ڤاڵدیز)لە ســاڵی (١٩٨٩) لە ئالاســکا، بڕی (١١) ملیــۆن گاڵــۆن نــەوت بڵاوبویــەوە، بۆیــان دەرکــەوت خۆیان بۆ چارەســەرکردنی ڕووداوێکی لەم شــێوەیە ئامــادە نەکردبوو، لەڕووی وەڵامدانــەوەی خێــراو هاوئاهەنگییــەوە، ئینجا حکومەتــی ئەمریکی هەســتا بەدەرکردنی یاســای تایبەت بەلێچوونە نەوتییەکان، لە یاسای پیسبوونی نەوتی ســاڵی(١٩٩٠)دا هاتووە، پێویستە سندووقێك دابنرێت بۆ وەڵامدانەوەی کتوپڕی ڕژانو بڵاوبوونەوەی نەوت.

هەبوونی پلانی وەڵامدانەوەی گشــتگیرو چالاك بۆ حاڵەتی ڕژانو بڵاوبوونەوەی نەوت، کردارێکی زیندووی وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوتە، لەگەڵ ئەوەشــدا لە هەندێــك حاڵەتدا نییە، بۆ نموونــە ئازەربایجان، بەرهەمهێنانی نەوتی زۆر بەخێرایی زیاد دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا پلانی وەڵامدانەوەی نیشتمانی نییە بۆ لێچوونە نەوتییەکان، ئەمەش ڕێگری دەکات لــە هاوکاریکــردنو لێك گەیشــتن لەگەڵ دراوســێکانیدا، لە کاتی چارەسەرکردنی بڵاوبوونەوەی نەوت لە دەریای قەزوین دا.

ئەوەشــمان لەبیر نەچێت، بڕی تێچوون بــۆ خاوێنکردنەوەی نەوتی ڕژاو جیاوازە، بەپێی هۆکاری جیاواز، وەك شــوێنی ڕووداوەکە، کاریگەریی لەســەر ناوچە هەســتیارەکان وەك ناوچە گەشــتیارییەکانو ئەوناوچانەی ژینگەیەکی هەســتیاریان هەیە (کۆمەڵگەی مەرجانــی)، لەگەڵ دووری لە کەنــاراوەکانو جۆری نەوتــی ڕژاو؛ چونکە خاوێنکردنەوەی نەوت لەنزیك کەنــاراوەکان زۆرتــری تێدەچێــت، بەبــەراورد لەگەڵ ئەوەی لــە زەریادا ڕوودەدات، هەروەهــا نەوتی خاوی ســووك خێراتر دەبێــت بەهەڵمو بڵاو دەبێتەوە، بۆیە توانایەکی کەمی پێویســتەو ئاســان خاوێن دەکرێتەوە، لە کاتێکدا نەوتی قورس پێویســتی بەتوانایەکی گەورەترە بۆ خاوێنکردنەوە، نزیکەی چوار ئەوەندەی نەوتی ســووکی تێدەچێت، کاتێك نەوت دەڕژێتە زەریــاوە، کرێکارەکان هەوڵدەدەن تــا بتوانن دوور لە کەناراوەکان نەوتەکە بهێڵنەوە، ماددەی کیمیایی جیاواز بەکاردەهێنن بۆ بڵاوە پێکردنی نەوتەکە لە ئاودا، ئەم مادانە ڕەنگە ژەهر بنو ببنە هۆی تووشــکردنی ماســییەکی زۆر بە نەوتو مادەی کیمیایی، یان لەڕێگەی بەکارهێنانی بەکتریایەك کە لەســەرنەوت دەژی، ڕێگەیەکە بۆ خاوێنکردنەوەی نەوت، هەرچەندە پەنا بۆ ســووتاندنیش دەبرێت، بەڵام ئەم ڕێگەیە مەترسیدارە بۆ کرێکارەکانو کۆنترۆڵکردنی ئاسان نییە. هەروەها بەکارهێنانی بەربەستی سەرئاوکەوتوو نەوتەکە بە خەستی دەهێڵێتەوەو پاککردنەوەی ئاسانە.

نــەوت کاتێك دەڕژێتە خاکەوە هێواشــتر بڵاو دەبێتەوە ،چواردەور گرتنی ئاسانە، بەڵام خاکی پیسبوو بە نەوت بەکەڵکی کشتوکاڵو لەوەڕگا نایــەت، ڕەنگــە ئاوی ناوچەکــەش پیس بــکات، بەکەڵکــی خواردنەوەو ئاودێریو ئاودانی ئاژەڵ نەیات.

دەپرســم: ئایــا حکومەتــی هەرێــم بــۆ ڕووداوی ڕژانــی نــەوتو وەڵامدانەوەی خێرا، هیچ سندوقێکی داناوە؟



سەرچاوە: کتێبی (الرقابة على النفط –دليل الصحفة فی مجال الطاقه والتنمية- التخلص من لعنة الموارد)- ريفينيو وتش-معهد المجتمع المنفتح.



سەرکەوتووەکان بێ قوتابخانە

بەرزان ئەبوبەکر

# شۆنگ جو-یۆنگ

## ١٩١٥- ٢٠٠١

**شـۆنگ جو – یۆنگ..** هیوندای یۆنگ، دوو ڕووی یەك دراون، هیوندای ویۆنگ، کەسێکی هـەژارو بێدەرامەت بوو، چۆن توانی گەورەترین کۆمپانیای ئۆتۆمبێل لە جیهاندا دابمەزرێنێت؟!

شۆنگ جو- یۆنگ لە ساڵی ١٩١٥ لە خێزانێکی زۆر هەژار چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، باوکی لە گوندێکی دوورەدەستی کۆریای باشوور جووتیار بووە، شـۆنگ هەر لە سـەرەتاکانی تەمەنیدا گوندەکەی خۆیانی جێ هێشـتووەو بەرەو سـیئۆلی پایتەخـت بۆ گەڕان بە دوای خەون‌و هیواکانیدا کۆچی کردووە، سـەرەتا لە دروستکردنی وەرشەیەکدا دەستی بە کرێکاری کردووەو بەردو قوڕی گواستۆتەوە.

شۆنگ سـەرەتا لاوێتی بۆ بەدەستهێنانی پاروویەك نان‌و بژێویی ژیانی زۆر نارەحەتی چەشتووە، هەر ئەم دەردەسەری‌و نارەحەتییەش بـووە بـە پاڵنەرێـك بـۆ پتەوبـوون‌و پەرەپێـدان‌و بەهێزبوونی کەسـایەتی‌و بەدەسـتهێنانی ئارامـی‌و خۆڕاگـری‌و کۆڵنـەدان، بۆ چاککردن‌و بەرەوپێشبردنی ژیانی پیشەیی‌و کۆمەڵایەتی!

شۆنگ کەسـایەتییەکی ئیجابی‌و چالاك‌و لەڕادەبەدەر گەشبین بوو، تەواوی کاروبارەکانی بەوپەڕی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی‌و دڵسۆزییەوە ئەنجام دەدا.

شـۆنگ جو-یۆنگ، لە ڕێگەی ئەو کارە سەختەی دەیکرد، بڕێك پارەی پاشـەکەوت کرد، لەگەڵ سەختی کارەکەیدا بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی جەنگی دووەمی جیهان دەسـتی پێکرد، ئەو کات لەژێر سـێبەری ئەو جەنگە وێرانکـەرە دڕندانەیەدا، بوارێك بۆ کرێکاری دەستی کار نەمایەوە، بەڵام شۆنگ جو-یۆنگ، بێهیوا نەبوو، بەڵکوو دەسـتی بە کارکردن کرد لە وەرشـەی چاککردنـەوەی بارهەڵگرە سـەربازییەکان، تا بە تەواوی فێری ئەو پیشـەیە بوو، لەسەر ئەم کارەشی بەردەوام بوو، تا کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی جیهان!

پێنج سـاڵ دوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهان، شـۆنگ جو-یۆنگ، وەرشـەیەکی دامەزراند بۆ چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل، ئەو کات تەمەنی تەنها ٣٢ ساڵ بوو..

### ئەو هەژارەی زانی خەونەکەی لە کوێیە!

شـۆنگ جو-یۆنـگ، دامەزراندنی وەرشـەیەك بـۆ چاککردنی ئۆتۆمبێـل کۆتـا ئـاوات‌و خەونـی نەبـوو، بەڵکو دوای سـاڵێك لـە دامەزراندنـی ئـەو وەرشـەیە، بەهـۆی وردەی بـەرزو هیواو ئاواتەکانییەوە، کۆمپانیایەکی ئەندازیاری بە ناونیشانی (هیوندای) دامەزراند، ئەم ناوە وشەیەکی کۆرییە بە مانای (کاتی ئێستا) دێت.

ئـەم کۆمپانیایە توانی سـەرکەوتنی گەورە تۆمـار بکات، بوو بەکـەم کۆمپانیـای سـەرکەوتوو بـە بەڵێننامـەی، دەرەکی بۆ بنیاتنانـی پرۆژەکانـی لـە دەرەوەی کۆریای باشـوور، کۆمپانیا ئەندازیارییەکـەی شـۆنگ جو-یۆنگ، ڕێزێکـی تایبەتی هەبوو لەنێو کۆمپانیاکانی دیکەدا.

ئـەم کۆمپانیایـە ڕۆڵێکـی دیـاری هەبـوو لـە بنیاتنانەوەو ئاوەدانکردنـەوەی هـەر دوو کۆریـا لە دوای جەنگی نێوانیان.. شـۆنگ جو-یۆنگ، هەمیشـە لەو باوەڕەدا بـوو، کە کاروبارەکان بەرەوباشـتر دەڕۆن‌و پێش دەکەون، هەروەها پێی وابوو کە ئەو بارودۆخە ناهەموارە، کاتییەو بێگومان تێدەپەڕێت!

یەکێك لە سـیماو خاڵـە جیاکەرەوەکانی شـۆنگ جو-یۆنگ، ئەوەبـوو کە کەسـێکە لە ڕادەبـەدەر، بڕوای بـە چوونە پێش‌و خۆخستنە نێو مەترسییەوە هەیە، بە پلەی یەکەم، خۆشەویستی‌و حـەزو ئارەزووی بۆ سەرکێشـی، بە ئەنـدازەی قومارکردن بوو، هەروەهـا هۆکارێکی دیکـەی بنەڕەتیش، بریتی بـوو لە چوونە دەرەوەی بۆ دەرەوەی سـنوورەکانی کۆریاو ڕووکردنە وڵاتێك کە نەیاندەناسی؛ بۆئەوەی پـەرە بە بیرۆکـەو بیروبۆچوونەکانی بداتو خزمەتێك پێشکەش بکات!

شـۆنگ جو-یۆنگ، هەمیشـە بە شوێن شـتی جیاوازو نامۆدا

دەگـەڕا، لەبەرئەوە بە خۆی و پرۆژەکانییەوە دەڕۆیشـت بۆ ئەو ناوچانـەی کە بـە کارەسـات گەمارۆدرابوون و لـە بارودۆخێکی سرووشـتی سـەختدان، وەکـو باشـووری ڕۆژهەڵاتی ئاسـیا، تا ناوچەکانی ئالاسکا!

لەگەڵ هەموو سەرکێشـییەکدا، هەمیشـە سـەرنجی لەسـەر چاندنی بیرۆکەو پرۆژەکانی بوو لەو ناوچانەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هیـچ کات کۆریـای زێدی خۆی لە بیـر نەدەکـرد.. کۆرییەکان قەرزاری ئەم کەسـایەتییەن؛ چونکە شـۆنگ جو-یۆنگ، ڕۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبوو، لە بنیاتنانەوەی کۆریادا لە دروستکردنی پـردو ڕێگاوبان و کارگە بـۆ وزەی ئەتۆم..چەندین بواری گرنگی دیکەی بنەڕەتی بۆ ژیان.

دوای سەرکەوتن و فراوانبوونی کۆمپانیاکەی، شۆنگ جو-یۆنگ، کارگەی دروسـتکردنی (هیوندای بۆ دروسـتکردنی ئۆتۆمبێل لە سـاڵی ١٩٦٧) ڕاگەیاند، سـەرەتای چالاکییەکانی بە بەسـتنی ئۆتۆمبێلی فۆرد بوو لەناو کۆریادا.

لـە سـەرەتای سـاڵانی حەفتاکانـدا، بـە شـێوەیەکی نەوعی گواسـترایەوە بـۆ کۆمپانیـای هیونـدای، کاتێـك توانـی کاری بەڵێندەرایەتی و بنیاتنان، پرۆژەی بیناسازی بەدەست بهێنێت بە نرخـی یەك ملیار دۆلار، بۆ بنیاتنانـەوەی مینا کە ناوچەیەکی شاخاوییە لە وڵاتی عەرەبستانی سعودی.

کۆمپانیـای هیونـدای، تەنها لـە یەك بـواردا کاری نەدەکرد، بەڵکـو چەندین بواری بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی گرتە ئەسـتۆ بەشـێوەیەکی زۆر پێشـکەوتووانە، کۆمپانیای هیوندای پارچەو کەلوپەلە کۆرییەکانی بە مەبەسـتی پاشـکەوت وەگەڕخسـتو بـەکاری دەهێنا؛ چونکە لەلایەکەوە کرێی گواسـتنەوەو گومرگی نەدەچووەسـەر، لەلایەکی دیکەوە کاتـی زۆری پێ نەدەچوو؛ تا کەلوپەلەکان لە وڵاتێکی دیکەوە بگاتە دەستی کۆمپانیا، هەروەها کۆمپانیاشـی لە کارەسـاتی زەرەرو زیان دەپاراست، ئەگەر هاتوو کەلوپەلەکانیان دوچاری زیانی گەورە ببوایەتەوە!

### شۆنگ جو-یۆنگ،حەزو ئارەزووی بۆ سەرکێشی:

شـۆنگ جو-یۆنگ، سەلماندی کە سەرجەمی سەرکێشییەکانی پێکاوەو لەو ڕێگەیەوە توانیویەتی سـەرکەوتن بەدەست بهێنێت، هاوکات کۆمپانیای هیونـدای ڕۆڵێکی دیارو بەرچاوی هەبووە لە ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

کۆمپانیـای هیواندای توانـی متمانەی نێودەوڵەتی بەدەسـت بهێنێت، شۆنگ جو-یۆنگ، هەموان ڕێزیان لێ دەگرت و کارەکانیان بـەرز دەنرخاند، ئەوەش بووە هـۆی ئەوەی کە حکومەتی کۆریا پاڵپشـتو هـاوکاری کۆمپانیـای هیوندای بوو، لـە فراوانبوون و بەهێزبوونی کۆمپانیاکەداو ڕۆڵی دیاری هەبووە!

شـۆنگ جو-یۆنگ، بەردەوام خۆی دەخسـتە مەترسییەوە لە کاروبارە بازرگانی و پیشەسـازییەکانیدا، سەرەتا ساڵی ١٩٧٣ هەستا بە دامەزراندنی گەورەترین کارگە بۆ دروسـتکردنی کەشـتی و ڕێکخستنەوەو بەگەڕخستنەوەی کەشتییە لەکارکەوتووەکان.

لەم پرۆژەیەشـدا بە هۆی پاڵپشـتی حکومەتەکەی سـەرکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێنا، هەروەها بەهۆی دەستی کاری بێشومارەوە، کە لەو پرۆژەیەدا کاریان دەکرد، هەروەها بە هۆی ڕێگەیەکی دەگمەنەوە، کە شـۆنگ جو-یۆنگ، بە بیریدا هات، کە لە سـاڵی ١٩٧٤ کۆمپانیای هیوندای پێشنیاری کۆمپانیای هیوندای کرد بۆ دروستکردنی کەشتی بەناونیشـانی (Hyundai Heavy Industries) یەکەم کەشـتی بەناوی(Atlantic baron) دروووست کرد.

* دەرکەوتنی یەکەم ئۆتۆمبێلی کۆری لە ساڵی ١٩٧٥، لەبەرهەمە دروووسـتکراوەکانی کۆمپانیای هیوندا، بەناوی (Pony) هێندەی نەبرد، کاری کۆمپانیا بەرفراوانتربوو، بەتایبەت لەسـەر ئاسـتی کرێکارە کۆرییەکان.

* لـە دوای ئەم فراوانبوونە شـۆنگ جو- یۆنـگ، کۆمپانیای هیونـدای بۆ ئەلکترۆنیـات، لە سـاڵی ١٩٨٣ دامەزراند، چالاکیی سەرەکی ئەم کۆمپانیایە بریتی بوو لە دروستکردنی کۆمپیوتەری تایبەت (لاپتـۆپ)و پەرەپێدانی، بەمەش جارێکی دیکە، دەبینین کە هیونـدای چووە نێو بوارێکی دیکەوە، کە پێشـتر ئەزموونی نەبووە لەو بوارەدا، بەڵام سەرکەوتنیشی تێدا بەدی هێنا.

لـە فەلسـەفەو بنەمـای شـۆنگ جو- یۆنـگ، ئەوەبـوو کە قەناعەتـی وابوو، کە پێویسـتە مرۆڤ هەمیشـە هەوڵ بدات بۆ بەرەوپێشـبردنی ژیانی، لە ناوازەترین هەستەکانیشـی ئەوەبوو کە کارو پیشـە بۆ هەزاران کەسـی وڵاتەکەی دەسـتەبەر بکات و بەشدارییان پێ بکات، لە بەرەو پێشبردنی وڵاتەکەیان.

شـۆنگ جو- یۆنـگ، هەمیشـە چـاوی لەسـەر توێژینەوەو پێشکەوتنەکانی دونیا بوو، ئەو باوەڕی وابوو کە هەر شتێك مرۆڤ خەیاڵـی بـکات، دەتوانێت بیهێنێتە دی. ئەگـەر بۆ ماوەیەکیش خـەون و ئاواتەکانی مرۆڤ دواکەوتن، ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ تەسلیم بە شکست ببێت و لە هیواو ئاواتەکانی پەشیمان بێتەوە.

* شـۆنگ جو- یۆنگ، پیاوێکی کۆمەڵایەتی بوو، بەشێوەیەك ڕۆڵـی بەرچاوی هەبوو، لـە کۆمەڵەو گـرووپ و لیژنەی میللی و وەرزشـییەکان و بەردەوام لەبەرەوپێشـبردنیاندا بـوو، هەروەها بەشـێوەیەکی بەرچاو پشـکی لە بەرەوپێشـبردن و سەرکەوتنی ئۆلۆمپیادی سیئۆل هەبوو لە ساڵی ١٩٨٨.

* شـۆنگ جو- یۆنگ، یەکەم کەسـی مەدەنی کۆریای باشوور بوو، کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ مۆسـکۆ ڕاسـت کردەوەو پەرەی پێـدا، ڕۆڵێکـی بەرچـاوی هەبوو لـە بونیادنانـی پەیوەندییە ئابووری و بازرگانییەکانی نێوان مۆسکۆو سیئۆل.

* خـەون و ئاواتەکانی شـۆنگ جـو- یۆنگ، تەنهـا لە بواری بازرگانی و پیشەسازی و بیناسازیدا چەقی نەبەست، بەڵکو هەوڵی بەدەسـتهێنانی سـەرۆکی کۆریای دا لە سـاڵی ١٩٩٢، دوای ئەوەی پارتێکی سیاسی دامەزراند، بەشداری هەڵبژاردنەکانی ئەو وڵاتەی کـرد، بەڵام لێرەداو لەم بوارەدا نەیتوانی سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنێت و نەیتوانی بگاتە کورسی دەسەڵات، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە بانگەشـەی هەڵبژاردندا پێشنیاری بۆ چارەسەرکردنی زۆرێك لە کێشە ئابووری و بازرگانییەکان کردبوو.

* لە سـاڵی ٢٠٠١ شـۆنگ جو- یۆنگ، ماڵاوایی لە ژیان کردو کۆچی دوایی کرد.

شـۆنگ جـو- یۆنگ، هـەژاری و نەبوونـی و دەردەسـەرییەکانی سـەرەتای ژیانی نەبووە ڕێگـر لەبەردەم هێنانەدیـی خەونەکانی، بەڵکـو بووە نموونەیەکی پرشـنگدارو دوای خـۆی خەڵکی چاو لە بوێری و بیرۆکەو کۆڵنەدان و پێشـکەوتنەکانی دەکەن، شـۆنگ جو- یۆنـگ، توانی ناوەکەی لە جیهاندا بدرەوشـێتەوەو ببێتە سـمبوڵی پێشـکەوتن و کۆڵنەدان و بەرەوپێشچوونی وڵاتەکەی و بەرزکردنەوەی پلەو پایەی وڵاتەکەی.

# بازاڕی تاعەت!

شۆخان عەلی

لە ڕۆژگارێکی پڕدەردیسەرو ناهەمواریو برسێتیدا، پیرەمێردێکی دنیادیدەو لەخوداترس، دەستی نەوەکەی گرتبوو بەرەو بازاڕی شار کەوتنە سەر ڕێ، منداڵ وەك ئەوەی لە گەڕەکێکەوە کەوتبێتە ناو جەنجاڵی شاریو ئەوەی یەکەمجارە دەیبینێت، کە خەڵکی هەریەکەو لەلایەك هاواریانە بۆ پەیداکردنی پاروویەك نان، هەریەکەو ئاوازێکی بۆ دڵڕفاندنی کڕیارەکانی داناوەو وەك بڵێی سترانی چاوەڕوانی منداڵەکانیان بۆ دەستی ئەمان بڵێن، هیچ نەمابوو سەرنجی بچکۆلەکە ڕانەکێشێت، تا پرسیارێکی نەکردبا لە باپیری ئۆقرەی نەدەگرت، بۆ وەڵامەکەش بە تاسەوە گوێیەکانی دەکردەوەو بەوردی لەگەڵ بیری خۆی بەراوردی دەکرد. ڕێگا زۆر بوو، ناوبازاڕ زیاتر قەرەباڵغ، تا گەیشتن بە دووکانێکی جگەرەفرۆش؛ منداڵ: باپیرە ئەمە چییە؟ دەکرێ من تاقی بکەمەوە؟ پیرەمێرد: نا ڕۆڵەکەم، ئەوە تاقیکردنەوەی نییە، تاقیکردنەوەی ئەوە، واتە: مامەڵە لەگەڵ مەرگو ئازاردانی ڕۆحمان، جا ئیتر ئەمەت زانی، دەتەوێ تاقی بکەیتەوە؟ منداڵەکەی گوتی: واتە: چۆن من تێنەگەیشتم؟ پیرەمێرد: ئەوە دووکەڵێکی کوشندەیە، کە خەڵکی هەڵی دەمژن بۆ ئاسوودەبوونی دەروونیان، بەڵام دوای تەواوبوونی، پێویستیان بە کڕینی ئۆکسجین هەیە؛ تا سییە لاوازەکانیانی پێ ئاو بدەنو نەهێڵن لەکار بکەوێت؛ چونکە ئەو دووکەڵە، کونی سییەکان دەگرێتو ڕێگری لە هەناسەدان دەکات، ئەمانەو زەرەری مادیشی لەگەڵدایە. -زەرەری ماددی چییە؟ -ڕۆڵەی خۆم، زەرەری مادی ئەوەیە، جگە کڕینی جگەرەکە، پێویست دەکات عەترێكو بۆنبڕێکی دەمیشی لەگەڵدا بکڕیت.. هەر جارێك، بۆئەوەی خەڵکی لێی بێزار نەبن، لەگەڵ فلچەو هەویری تایبەتی ددان، یان سەردانی دکتۆر بۆ پاککردنەوەی ئەو کلسەی کە بەهۆی ئەوەوە تووشی دەبن. ئێستا گوڵەکەی باپیرە، وەرە با بچینە لای گوڵفرۆشێك کەمێك مێشکمان ئارام ببێتەوە. دوای ماوەیەکی کەم لە ڕێکردنیان، لەپڕ پیاوێکی چوارشانە بە ڕوخسارێکی بەرێزەوە وەخت بوو بکەوێت بەسەر پیرەمێردداو بەلارەلار کەمێك ڕۆیشتو لەولاتر خۆی لەسەر زەویەکە درێژکردو لەبەر خۆیەوە ورتەورتی دەکرد. منداڵە بە سەرسامی سەیری کردو گوتی: باپیرە، ڕەنگە ئەوە شێت بێت، من دەترسم! پیرەمێرد: نا، ئازیزم ئەوە شێت نییە، بەڵکو خۆی بەدەستی خۆی دەچێتە مەیخانەو ئەو ڕێزەی یەزدان پێی بەخشیوە، لەوێ لەگەڵ بڕێك پارە بەجێی دەهێڵێتو بەم وێنەیە دێتەوە دەرێ! منداڵەکە دیسان کەمێك ئاڵۆز بوو و پرسیاری کردەوە: مەگەر لەوێ چی لێ دەکەن؟ -هیچی لێ ناکەن نووری باپیرە، تەنها میوانداری



دەکەن بەو شێوەیەی ئەم دەیەوێت، دەیەوێت دنیایەك لە جوانیی خەیاڵ، بۆخۆی دروست بکات، بەڵام لەم دنیایەدا ڕێسامان هەیە، ئەگەر لێت لادا چێژی لێ نابینیت، لەو لادانەش پێویستە لە ڕیزی مرۆڤ بچیتە دەرەوە. -ئەی باپیرە! تۆ دێیتە بازاڕ بۆ کوێ دەچیت؟ -ئێستا دەتبەم ڕۆڵەکەی باپیرە، با بگەینە جێ.

بەدەم پرسیارەکانی منداڵەکەو وەڵامە بەپێزەکانی باپیرە ڕێیان کرد، تاگەیشتنە دووکانی عەترفرۆشێکو باپیرە گوتی: ڕۆڵەکەم ئەمە دووکانی هاوڕێی منە، جارجارە دێم، ئەگەر گەشنەبمەوە بە دیداری؛ ئەوا بە بۆنی خۆشی دووکانەکە، ڕۆحم دەگەشێتەوە. دواتر ڕۆشتنە چایخانەیەکی ڕازاوە گوڵزارو خاڵەی چایچی قسەخۆشو لەخوداترس، لەگەڵ بۆنی گوڵاوی چایخانە، هەموو لایەکی گرتبوو.

باپیرە گوتی: بینایی باپیرە، ئێرەش جێی حەسانەوەی باپیرەیە، کاتێك ماندوێتی ژیان وەختە پشتم بچەمێنێتەوەو هەندێجار لێرە کۆڕ بۆ یادی بەدیهێنەرو خۆشەویستیی بەدیهێنەر دەگرین. دواتر باپیرە هەستاو گوتی: «ئێستا دەچینە بازاڕی تاعەت ڕۆڵەکەم».

منداڵ: با پیرە ئەوە کوێیە؟ پیرەمێرد: کە ڕۆیشتین دەیبینێت، چی ڕۆحێکت بەبەردا دێت لەوێ، وەك ئەوەیە بە ئاوی سازگار ڕۆحت بشۆرنەوە وشەکانی ئەوێ.. منداڵە بە وریاییەوە گوێی گرتبوو، بە هەڵپەوە ڕێی دەکرد لەگەڵ باپیرێ؛ تا بگەنە بازاڕی تاعەت، وەختێك گەیشتنە بەردەم گەورەترین کتێبخانەی شار، پیرەمێرد وەستاو ڕووی کردە دەرگاکەی‌و گوتی (بڕۆین دیدەکەم! وا لەناوەوە دەبینیت ڕۆحت نازانێت چ سەمایەك بۆ چ کام لەو پەرتووکانە بکات). پێکەوە ڕۆیشتنە ژوورو منداڵەکە، خێرا ڕای کردە لای پەرتووکە منداڵانەکانو یەك دوانێکی هەڵگرتو هاواری کرد! باپیرە ئەمانە دەڵێی دنیایەکی تایبەتە بۆ من دروستکراوە، ئای چەندە جوانن! پاشان سەیری باپیری کرد کە بە ڕەفتارەکانی ئەم پێدەکەنیو دیسان پرسی: تۆش حەزت لەمانەیە باپیرە، وا نییە؟ باپیرە زەردەخەنەیەکی تری کردو گوتی: ڕۆحەکەی باپیرە، ئەوانە بچووکو پاکن وەك ڕۆحی خۆت، بەڵام ئاودەری دڵو ڕۆحی من لەوێن، وەرە با پێت نیشاندەم. کە ڕۆیشتن دیتیان کۆمەڵێك پەرتووك وا باپیرەش بە هێزێك بۆی هەڵدەگێڕێتو لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر پەرەیەکی، پەرەیەکی گەشاوەتری ڕووخساری هەڵدەدرێتەوەو دەڵێت: «ڕۆڵە بچکۆلانەکەم، ئەگەر لێرە پەروەردە بیت؛ دەبیتە مرۆڤێکی کامڵ؛ چونکە ئەم هەموو ڕێنموونیکارە خۆیان دەخەنە بەردەستت! تا پەروەردەت بکەن، چەندین ڕێگای ژیان فێر دەبیت، پێش ئەوەی ڕێگاکانی ژیان بێنە ڕێت.

دوای ئاودانی ڕۆحیان بە خوێندنەوە، باپیرەو ڕۆڵەکەی گەڕانەوەو باپیرە گوتی: «ئەمە ڕێگای بازاڕ بوو ڕۆڵەکەم، کە بۆ من بازاڕی تاعەتە، بەڵام بزانە کە ڕێگای ژیانیش بەهەمان شێوەیە، ئەگەر بتەوێت بۆ خۆتی ئاوان دەکەیتەوە، یان وێرانی دەکەیت، بەداخەوە ئەگەر وێرانت کرد؛ ئەوا تۆ مرۆڤ نیت؛ چونکە مرۆڤ واتە: ئاوەدانی، واتە: ڕووناککەرەوە، واتە: نیشاندەری ڕێگای ڕاست».



# تۆ لەسەر هەقیت، منیش هەروەها

هودا عبدالله

لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو، داوای لە دوو کچە دووانەکەی کرد، کە بچنە سەر کانی ئاو بێنن، ئەوان زۆر یەکتریان خۆشدەویست، لەبەرئەوەی لەناو یەك وێلاش لەسکی دایکیاندا گەورە بووبوون، بۆیە بەردەوام پێکەوە بوون، هەرگیز بەبێ یەکتر نەدەسوڕەوان، پێکەوە لەژێر یەك پێخەف دەخەوتنو لەتەنیشت یەکترەوە نانیان دەخوارد، پێکەوە دڵخۆشو پێکەوە دڵتەنگ دەبوون، لەو کاتەی کە خەریکبوون دەڕۆیشتنە سەر کانی، لە کۆتایی ڕێگاکە بووە دوو ڕێگا، دەبوو یەکێکی هەڵبژێرن، یەکێکیان گوتی با لە ڕێگای لای ڕاستەوە، بڕۆین بە قسەی دایکم بێت، ئەم ڕێگایە دەمانگەیەنێتە کانییەکەو ئەمە ڕێگا ڕاستەکەیە، ئەوەی تریان گوتی: نا، با لە ڕێگای لای چەپەوە بڕۆین؛ چونکە من ئەزموونم هەیە لە پێشوودا بێرەدا ڕێم کردووە، دەزانم دەگەینە کانییەکەو ڕێگا ڕاستەکەیە، ئەوەی یەکەم گوتی: بەڵام دایکم باشتر دەزانێ لە تۆ، کچەکەی دووەمیش گوتی: من گەورەترم بە چەند سەعاتێك، کەواتە: دەبێ تۆ بە گوێی من بکەیتو بێیتە سەر ڕای من، دەبێت بە لای چەپدا بڕۆین، لەو یەك، لەم دوو، لەو سێ، بوو بە دەمەقاڵەیان، تا وای لێهات لەیەکتر زویر بوونو جیابوونەوە، هەریەکەیان بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتن کە پێیان وابوو، ڕێگا ڕاستەکەیە، کەسیان ئامادە نەبوو، بیروڕای ئەوەی تر قەبووڵ بکاتو واز لە بیروڕای خۆی بهێنێت..

بەهەرحاڵ ڕۆیشتنو ڕۆیشتنو ڕۆیشتن، تا دواجار هەردوو ڕێگاکە لە کۆتاییەکەی بوو بە یەکو بەیەك گەیشتنەوەو پێکەوە گەیشتنە کانییەکە، ئەوکات بۆیان دەرکەوت، کە مەرج نییە تەنیا تۆ لەسەر حەق بیت، لەگەڵ ئەوەی خەڵکی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، ڕێگای جیاواز دەگرنە بەر، بەڵام لە کۆتاییدا هەر پێی دەگەن، هەرچەندە ڕێگاکانیان جیاواز بێت.

# کێ باوکە؟!

زەینەب سەعید

چەند پەیڤێك سەبارەت بە باوك، منیان هێنایە گریان!!!

پرسیارێك ئاڕاستەی چەند فێرخوازێكی ماستەر كراو هەندێك لە وەڵامەكان سەرنجڕاكێش بوونو هەندێكیشیان ئاسایی بوو، بەڵام باشترینیان ئەو وەڵامەبوو كە وانەبێژەكە خستییە ڕوو: تێیدا نووسرابوو:

باوك ئەو كەسەیە، كاتێك كە پێڵاوەكانی لەپێ دەكەیت، لەبەر گەورەیی پێڵاوەكانیو بچووكی پێیەكانت، هەڵدەكەویت.. كاتێك چاویلكەكەی لەچاو دەكەیت، هەست بە گەورەیی دەكەیت، ئەو دەمەی جەمەدانییەكەی لەسەر دەكەیت؛ هەست بە شكۆمەندی دەكەیت، ئەو ساتەی داوای كلیلی ئۆتۆمبێلەكەی لێ دەكەیت خەون دەبینیت، كە تۆ ئەویت.

هەندێجار شتێكی بێبایەخ بە مێشكتدا دێت، دەستبەجێ - لە كاتێكدا لە دەوامدایە- پەیوەندی پێوە دەكەیت، ئەویش بە سینەفراوانییەوە وەڵامت دەداتەوە، بەبێ ئەوەی ئاگادار بیت، ڕەنگە بەڕێوەبەرەكەی سەرزەنشتی بكات، یان هاوڕێیەكەی بێتاقەتی بكات، یان پەیداكردنی خەرجیتان باری سەرشانی قورس كردبێت، تۆش بەوپەڕی خوێنساردییەوە داوای لێ دەكەیت: بابە، كە هاتیتەوە، لەگەڵ خۆتدا شەربەتی شیلكم بۆ بهێنە، ئەویش وەڵامت دەداتەوەو دەڵێت: بە چاوان، منداڵێكی باش بە، ئازاری دڵی دایكت نەدەیت.. كاتێكیش دەگەڕێتەوە ماڵو بەهۆی ماندووبوونو گەرماو سەرقاڵی لە كارەكەیدا، داواكەتی لەبیر چووە، تۆش پێی دەڵێیت: بابە كوا شەربەتەكە؟ ئەویش گرنگیت پێ دەداتو دەچێتە دەرەوە، ئەو داوا بێبایەخەت بە دڵێكی خۆشەوە جێبەجێ دەكات، ماندویەتیی خۆی لەبیر دەباتەوە.

ئەمڕۆكەش... پێڵاوەكانی لەپێ ناكەیت، بەهۆی كۆنیی مۆدێلەكەیەوە، بەبێ بایەخ تەماشای ئەو جلوبەرگو كەلوپەلو ئۆتۆمبێلەكەی دەكەیت، كە كاتی خۆی، لەلای هاوڕێكانت، خۆتت پێوە هەڵدەكێشا؛ چونكە لەگەڵ ڕەفتاری تۆدا نایەتەوە، قسەكانیت پێ پەسەند نییەو قێز لە كردارەكانی دەكەیتەوە، گەر چاوی بە هاوڕێكانی تۆ بكەوێتو لەگەڵیاندا دابنیشێت، تووشی ڕووگیریو خەجاڵەتی دەبیت!

ئەو كاتەی دوا دەكەویت، دڵی لات دەبێتو پەیوەندیت پێوە دەكات. تۆش وا هەست دەكەیت، كە بێزارت دەكاتو گەر نیگەرانیو پەیوەندییەكانی دووبارە بوونەوە، وەڵامی نادەیتەوە، كە درەنگیش دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ، ئەو سەرزەنشتت دەكات، بوئەوەی هەست بە بەرپرسیارێتی بكەیتو بەردەوام دەبێت لە پەروەردەكردنت؛چونكە ئەو شوانەو هەموو شوانێكیش بەرپرسە لە ژێردەستەكانی، تۆش دەنگت بەسەریدا بەرز دەكەیتەوەو بە وەڵامدانەوەت بێزاری دەكەیت، ئەویش بێدەنگ دەبێت، لەبەرئەوە نا كە لێت دەترسێت، بەڵكو لەبەرئەوەی تووشی شۆكو حەپەسان بووە!

تا دوێنێكە بوو، گەنجی بەگوڕ بوو، دەیكردیتە سەر قەڵاندۆشكانی، ئەمڕۆش تۆ، زۆر لە دوێكەی ئەو باڵابەرزتری، بیرت چۆتەوە كە لە كاتی قسەكردندا، لە پیتەكاندا هەڵەت دەكرد، ئەمڕۆش كەس بێدەنگت ناكات؟

هەرچەند تەنگت پێ بچنێت، ئەو هەر باوكتە.. هەروەك چۆن لە كاتی منداڵیتدا، بەرگەی گەمژەییو نەزانینتی گرت، جا تۆش ئارامبە لە نەخۆشكەوتنیو پیریتیی ئەودا.

جارێكیان لێیان پرسیم چ پیاوێكت خۆش دەوێت؟ گوتم: ئەوەی كە نۆ مانگ چاوەڕێی كردمو بەخۆشییەوە پێشوازی لێ كردمو كە تەندروستیی خۆی كردە قوربانی من، بۆ پەروەردەكردنم، ئەو كەسە گەورەترین خۆشەویستی لە دڵمدا دەمێنێتەوە بۆ هەتاهەتایە.



# خامەی خەمێك

کیژان فەرەج

ئـەو ڕۆژە، بە تـەواوی ژیـان هیلاکی کردبـووم، هەرچەند دەمویسـت کەمێك بیربکەمـەوە، نەمدەتوانی.. دەمویسـت زوو ڕووداوەکانـی ئـەو ڕۆژە لەیاد بکەم، نەمدەتوانـی! ماندووبووم، هەنـگاوم بە قورسـی بۆ دەنراو هەسـتم بەبوونـی زەوییەکەی ژێر پێشـم نەدەکرد! بەجۆرێـك ڕووداوەکان کاری تێ کردبووم، بەقورسـی خۆم پێ کۆنترۆڵ دەکرا، بێئاگاو بێبیرکردنەوە لەبەر خۆمـەوە، چەندجارێك ئەم وتەیەم دەگوتەوە: (ئای، خۆزگە ئەم دونیایە، هەمووی خەون دەبوو)، چەند خۆشـە کاتێك خەونێکی ناخـۆش دەبینیتو بەئاگات دەهێننەوە، دەڵێیت: ئۆخەی خودایە گیان کە خەوبوو... دەمگوت: ئای چەندخۆشـە ئێسـتا کەسـێك بێتو ڕام بوەشێنێو بڵێت: هەستە، هەستە، هەمووی خەون بوو!

بـەم بـارەوە، تـا گەڕامـەوە ماڵـەوەو پـاش نوێژکـردنو سەرخەوشـکاندنێك، کەمێك ئارامی هاتەوە بـە دڵمداو وتەکەی پێشـتری خۆمم بە بیـردا هاتەوە، بە خۆمم گوت: باشـە چۆن دەکرێـت وا بڵێم؟! ئەی مەگـەر ئەم ژیانە، خۆی لە خۆیدا وەك خـەون نییە؟ کاتییـەو دەڕوات! ئای چەند نـەزان بووم، چەند زوو لـە یادم کـرد! ئاخر چـۆن دەکرێت لە یـادم کردبێت، کە ئـەم ژیانەمـان وەك سـەرابێکەو دەڕواو ژیانە هەمیشـەییەکە چاوەڕێمـان دەکات، ئەو ژیانەی پڕیەتی لە ئارامیو سـەلامەتی، لە خۆشەویسـتیو یەکسـانی، لـەوێ ڕق نابینـی، ئیرەیی نییە، وتەی نەشـیاوو زبر نابیسـتی ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴾ الواقعـة: ٢٥ - ٢٦، لەوێ بۆ هەمیشـە لەگەڵ ئازیزانو خۆشەویسـتانتدایتو هەرگیـز لێیان دانابڕێیـت، چی دی ئاهی دووریو لەدەسـتچوون ناچێژیت، ئەوێ نیشتمانی ڕاستەقینەیو مەنزڵگای هەمیشەییمانە.

ئای چەنـد زوو ئەم دیمەنانەم لەیاد کرد، لە کاتێکدا هەموو کات دەمخسـتنە خەیاڵمو وێنام بۆ دەکێشـان، ئاواتم بوو خودای میهرەبان بە زێدەمیهرەکەی بمانگەیەنێت پێی، تاسـەی دیداری نیشـتمان، زۆر کات ئارامی لێ بڕیبووم! ئێسـتا چۆنە هێندە بە خەمێك هەموویم لەیاد کرد!

خودایـە بمانبـورە، خەریکیـن ژیانـی کاتیمان لـێ دەبێتە هەمیشـەییو خەفەتو ناڕەحەتییەکانیمان لەلا گەورەو گەورەتر دەبێـت، لەبیرمان کردووە، دەبێت تەنها شـەکوای دڵمان بۆ لای خۆت بەرین، یەعقووب ئاسـا (سـەلامی خودای لێ بێت) بڵێین: ﴿ قَالَ إِنَّمَا أَشْكُوا بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ یوسـف: ٨٦، سـەیرە ئێمە ئامادەین لای هەموان فرمێسك بڕێژین، بـەڵام پێمان قورسـە لەسـەر بەرماڵەکەمان، تاقە فرمێسـکێك هەڵبڕێژینو شـەکوای حاڵمانت بۆ بەیان بکەین، پڕ بە سینەمان بۆنی ئارامی بچێژین لە ژێر میهرتدا.

هەموو کات سـەیرم لێ دێت، چۆن دەکرێت مرۆڤ لەبەرامبەر خەمو ناخۆشـیو نەخۆشیو لەدەستدانی کەسە خۆشەویستەکانیدا ئارامگـر بێت؟ ئەگەر بێتو بڕوای بە ژیانی هەمیشـەیو قیامەت نەبێت؟سـەیرم لـێ دێـت چـۆن دەکرێـت خۆمان لە خۆشـییە حەرامکراوەکانـی بگرینـەوەو لەڕەزامەنـدی خـودادا بمێنینەوە لەکاتێکدا قیامەتو ژیانی دنیامان لەلا گاڵتە بێت؟ بەپێچەوانەشەوە، چـۆن دەکرێت ئێمە کە دەڵێین: بڕوامان بەوە هەیە، ئەم دونیایە کاتییەو بۆ تاقیکردنەوەو گەیشتنە بە دونیاو مەنزڵی هەمیشەیی، بەڵام لەبەرامبـەر تاقیکردنەوەیەکی خودایيو خەمێکی بچووکدا، چـۆك دادەدەین، وەك ئەوەی بڵێین ئیتر ژیانمان لەدەسـت چوو!! بۆ ئێمە بە ژیانی ڕاستەقینە گەیشتوین، تا لەدەستمان بچێت؟ نا، ئازیزم خەفەتی ڕاستەقینە ئەو خەفەتەیە، کە مرۆڤ لەم ژیانەیدا خۆش بژیو لە ژینی هەمیشەیشیدا ناڕەحەت!

* ئازیزم، ژیان زۆر جوانە، گەر وەك پردێك سـەیری بکەین بۆ گەیشـتنمان بە نیشـتمانی هەمیشـەیی! ئـەو کات دەتوانین خۆڕاگر بین بە هەموو قورسـاییەکانییەوە، وەك ئەو کەسەی لە نەخۆشـییەکی سـەختدایەو پێی دەوترێت، دوای چەند ساڵێکی کـەم، بەتەواوی چاك دەبیتەوەو پشـوو دەدەیتو ژیانێکی تەواو خـۆش دەکەیتو بۆ هەتا هەتایە نەخـۆش ناکەویتەوە! ئەوکات نەخۆشەکە سەرەڕای گرانی نەخۆشییەکەی، هەر دڵخۆشە؛ چوون دەزانێـت نەخۆشـییەکەی کاتییەو لەشسـاغییەکی هەمیشـەیی چاوەڕوانییەتی..

* ئاواتمان خۆشبەختی هەردوو دونیاتانە خوێنەرانی ئازیز..



# نزایەکی زبر، یان سەودایەکی نابەرابەر!

کۆسار سوبحان

نازانم ئەوەی لە دڵمدایە، چۆنو بە چ زمانێك، بە چ ئاوازێك دەری ببڕم؟ هەندێجار مرۆڤ لە ئاست نهێنییەکانی ژیاندا، سەرسام دەبێتو دەبێتە مرۆڤێکی پەیکەرئاساو بەخۆی دەڵێت: بۆ وردترو ژیرانەتر بیرم نەکردەوە، بەڵام ئەمەش هەر بۆ دڵدانەوەی خودی مرۆڤە، ئەگینا مرۆڤ لە ئاست نهێنییەکانی گەردونو گەورەیی دروستکارەکەیەتی، شتێکی وەهای پێ ناکرێتو ناتوانێت پەی بەنهێنییە جوانەکان ببات، بۆیە هەر زوو دەکەوێتە هەڵەی گەمەکانی ژیانەوە.

**چیرۆکەکەی منیش، لێرەوە دەست پێ دەکات:**

مرۆڤ کاتێك لە تەمەنی لاوێتیدایە، تەنها ئەو ڕێگەیە دەبینێت کە پێیدا دەڕوات، ئەگینا ناتوانێت ئەو شتانەی کە دێنە سەر ڕێگەی، پێشبینییان بۆ بکات. من لاوێك بووم هەمیشە هەستم بەناو ناخی خۆم دەکردو دەمزانی کە هەندێك لە مرۆڤەکانی دەوروپشتم جیاوازم، بەوەی کە لە ناخمدا عیشقێکی جوان هەبوو، هەر شتێکم بکردایە بەو عیشقو پەرۆشییەی ناودڵو ناخمەوە دەم کرد. لەبەرئەوە هەر بەعەشقەوە ژیانی هاوسەرێتیم پێك هێناو بەعەشقەوە هەنگاوم دەناو بەعەشقەوە بیرم دەکردەوە، لەگەڵ خێزانەکەمدا زۆر بەختەوەر بووم، خۆشیو ناخۆشییەکانی سەرەتای ژیانمان پێکەوە بەش دەکردو تێدەپەڕاند. پەیوەندیمان لەگەڵ خزمو دۆستانی هەردوو لاماندا زۆر باش بوو، تاوەکو سێ چوار ساڵێك بەم شێوەیە ژیانمان بە خۆشیو بەختەوەرییەوە دەگوزەراند. بەڵام لەدوای ئەوە، بیری نەبوونی منداڵ لەلای هەردووکمان چەکەرەی کرد، هەربۆیە بڕیارماندا بچینە لای پزیشك، تاوەکو هەشت ساڵ ئێمە ژیانمان بەبێ منداڵو بەچاوەڕوانییەوە بردە سەر.

هەموو جارێ بیرکردنەوەکانم، خەریك بوو بە هەڵەیاندا دەبردم. کاتێك دەمبینی خێزان هەیە، خاوەنی منداڵی زۆرە، بەڵام بێ بنەماو بێ خۆشەویستیو هەردەم ئاژاوەو ناخۆشی بوو لە نێوانیاندا، بەخۆمم دەگوت: ئێمە خێزانێکی بەختەوەرین، ئەی بۆ منداڵمان نابێت؟ منو خێزانەکەم، هەمیشە ئومێدمان هەبوو، بەڵام بەڕاستی هەندێجاریش بێزار دەبووین، خەیاڵە ناخۆشەکانمان، ئومێدی لە دەست دەداینو دەیڕووخاندین، بەڵام



لەبەرئەوەی کە من لەناخمدا، عشـقێکی زۆر بەهێز هەبوو، هەر بۆیە خێرا، ئـەو ئومێدەم بۆ خۆمو خێزانەکەم بنیات دەنایەوە. هەمیشـە بە خۆمم دەگوت: مرۆڤ بۆچی وەهایە، هەموو شتێکی دەوێت، خۆ من زۆر شـتم هەیە، بەڵام هـەر بەردەوام بیر لەوە دەکەمەوە، کە منداڵم نییە. تاکو لە ئێوارەیەکی بەهاردا، شەماڵێکی فێنك هەڵی کردبوو، خۆر تازە بەتازە خەریکی ماڵئاواییکردن بوو لە ئاسـمانی شـیندا، منیش تازە بەتازە هیواو ئاواتەکانم بەرەو رووم دەهاتنو خۆیانیان پێ دەناساندم.

خێزانەکـەم هاتـە لامو مزگێنـی ئەوەی پـێ دام، کە خودا ئاواتەکـەی بەدی هێناینو کاروانمـان لە رێگەیە. بڕوا بکەن لەو کاتەدا نەمدەزانی چی بڵێم، وەها حەپەسـابووم، بەتوندی هاوارم کرد: خودایە سوپاس بۆ تۆ! هێندە خۆشحاڵ بووم، مەگەر کەسێك هاوشێوەی خۆم بێت، تا لەو خۆشحاڵییەم تێبگات.

منیـش هـەروەك چۆن کە گـوڵ بارانی بەهاری بەسـەردا دەبارێت دەپشکوێت! ئاوەها گەشامەوە!

کاتێکیش منداڵەکەمان هاتە دونیاوەو لەدایکبوو، لەبەرئەوەی کـە بەرهەمی ئەو عیشـقە بوو، کـە لە دڵماندا پاراسـتبوومان زۆر خۆشـمان دەویسـت، خزمو دۆستانیشـمان بەهەمان شـێوە خۆشەویسـتیی خۆیـان هەریەکـەو بەجۆرێـك بـۆ دەردەبڕی. تـا منداڵەکەمان بوو بە پێنج سـاڵان، بەڵام بەداخەوە تووشـی نەخۆشـی هات، رۆژ بەرۆژ تەندرووسـتی خراپتـر دەبوو، هەر جـارەو کـە دەمانبردە لای پزیشـك دەیگوت: با ئـەم دەرمانانە بخوات چاك دەبێت.

تاوەکو رۆژێکیان تەندرووسـتی زۆر خراپ بوو، بردمانە لای پزیشكو پێی گوتین: ئەم منداڵە پێویستە ببرێتە دەرەوەی وڵات. بۆیە دەسـتبەجێ ترسـمان لێ نیشتو بە پزیشـکەکەمان گوت: هیچـی خراپ هەیە؟ ئەویش گوتی: خودا گەورەیە، بەڵام دەبێت ببرێتە دەرەوەی وڵات.

هـەر بۆیـە رۆژی دواتر، دەسـتم بـە ئامـادەکاری کرد بۆ دەرەوەی وڵات. پـاش ئامادەکارییەکان خـۆمو خێزانەکەم لەگەڵ کچـە تاقانەکەم، کە تاکە هیوای مـنو دایکی بوو بەرێ کەوتین بـۆ دەرەوەی وڵات. لـەوێ پزیشـکەکان هەندێك پشـکنینیان بۆ کرد، پاش تێڕوانینی پزیشکەکان، بۆ پشکنینەکانی منداڵەکەمان، پزیشـکەکە سـەیرێکی منو خێزانەکەمی کردو گوتی: بەداخەوە حەزم دەکرد، هەواڵی خۆشـتان پێ بدەم، بەڵام بۆ خۆتان دەزانن ژیانو مردنو نەخۆشی، هیچی بەدەستی ئێمە نییە، پێویستە زۆر خۆڕاگر بنو بە ئومێدەوە چارەسـەر بـۆ منداڵەکەتان وەربگرن، تاکە رێگەش نەشـتەرگەرییە ئەو نەشتەرگەرییەش لە سەدا دوو سـەرکەوتوو دەبێت، یـان دەبێت بەمە رازی بـن، یان چاوەڕێی مردنی لەسەر خۆی منداڵەکەتان بن. هەربۆیە بەترسو لەرزەوەو بـەو عیشـقە جوانەی کـە هەمیشـە لەدڵماندا پاراسـتبوومان، بڕیارماندا نەشتەرگەری بۆ بکەین.

پـاش ئەوەی کاتـی نەشـتەرگەرییەکەی بۆ دانایـن، پاشـان گەڕاینەوە وڵاتی خۆمان. کە گەیشتینە ماڵەوە، بەسەرهاتەکەمان بۆ خزمو کەسـوکارەکەمان گێڕایەوە، هەموان زۆر نیگەران بوون، هەمیشە دەسـتو دەممان بەنزاو پاڕانەوە بوو؛ تا خودای گەورە شیفای بدات.

دڵم زۆر پڕ بوو، هەموو شـتێك سەرنجی ڕادەکێشام، ئێواران سـەیری چۆلەکەکانم دەکرد، پێکەوە گەمەیان دەکردو جریوەیان دەهـات. سـەیری منداڵانـی کۆڵانم دەکـرد، کە چـۆن بەپیری باوکییانـەوە دەچوون، سـەیری ئەو دەرۆزەکەرانـەم دەکرد، کە دەستییان لە خەڵکی پان دەکردەوەو داوای یارمەتییان لە خەڵکی دەکـرد، منیـش بەردەوام دەسـتم بەرەو دەرگانـەی خودا بەرز دەکردەوە، هەندێجار هەناسـەکانم قەتیـس دەمانەوە، کە چۆن ئـەم هەمـوو خەمو پەژارەیـە، لەنێو ئەم دڵـە خەمبارەی مندا جێگەی دەبێتەوە.

هەربۆیـە شـەوێکی درەنـگو نزیکـی بەرەبەیـان، چوومە سـەربانی ماڵەکەمـانو سـەیری زەویم کـردو زانیـم ئەوانەی کە لەسـەر زەوین، ناتوانن چارەسـەری دەردی منو نەخۆشـیی منداڵەکەم بکەن. هەربۆیە دەسـتەکانم بـەرز کردەوەو رووم لە ئاسـمانی بێپایان کردو وەك ئەو کەسـەی کە خۆی ون دەکاتو تێکەڵی دونیای رۆح دەبێت، بەو شـێوەیە رووم لە خودای گەورە کـردو گوتم: خودایەگیان، چـارەی دەردم تەنها لای تۆیە، بۆچی چارەم ناکەیت؟! من بەو شـێوەیە بەکوڵ لێت دەپاڕێمەوە!؟ زۆر گریـام، چاوەکانم وەك بارانی بەهار فرمێسـکیان دەڕژاند. دوای ئـەو ڕازونیـازەی کە لەگەڵ خودای خۆمدا کـردم، دڵم هەندێك ئارام بوویەوە.

پـاش ماوەیـەك کاتی دکتۆرمان هاتە پێشـەوەو چووینەوە بـۆ دەرەوەی وڵات، بـەر لـە نەشـتەرگەرییەکە، پزیشـکەکان هەمـان پشـکنینەکانیان بۆ منداڵـە تاقانەکەم کـردەوە. پاش سەرنجدانیان لە پشکنینەکان پزیشکەکە بەسەرسامییەوە داوای منداڵەکەی کرد، پاشان گوتی: ئەم منداڵە هیچ کێشەیەکی نییەو پشـکنینەکانی نۆرماڵن، سەری سـوورما، کە ئەمە ئەو منداڵەی پێشـوو بێت، کە بینیویەتی، هەر بۆیە لـەو کاتەدا تەزوویەك بە جەسـتەمدا هاتو دەستم کرد بە گریانو گوتم: خودایەگیان من شـەکوای حاڵی خـۆم بۆ لای تۆ هێنا، جۆرێـك لە گلەیی و گازندەو تەنانەت لە سنوور دەرچووم لە نزاکانمدا، بەڵام تۆ بە میهرەبانیو بەزەیی خۆت، چارەسـەری سەرسوڕهێنەری منداڵە نەخۆشەکەم وەڵامی منت دایەوە.

پێشـتر لای مـن، ژیان تەنیـا هاواری کورتـی منداڵەکەم بوو، لەو سـاتەدا کە خودای گەورە شیفای منداڵەکەمی دابوو، خۆشـیو خۆشحاڵی باشـبوونی منداڵە تاقانەکەم لەبیر کرد، لـە تاو ئـازاری رۆحم کە گلەییم لە خـودای گەورە کردووە، هەربۆیـە هەر کاتێك سـەیری منداڵەکەم دەکـەم، بێجگە لە گریانو دەربڕینی شـەرمەزاری لەبەرامبەر خـودای گەورەدا هیچی ترم پێ ناگوترێت.




# ئەو کۆمەڵگایەی گۆڤاری بڕیار دەیەوێت!

* گۆڤاری بڕیار..

ئامانجی پەروەردەکردنی تاکێکی تەندرووستو بەسوودە بۆ خۆیو کۆمەلگەکەی؛ چونکە پەروەردەکردنی تاکەکانی کۆمەلگا، ئەو ڕێگایەیە کە کۆمەلگا دەگەیەنێتە لوتکەی سەرکەوتنو بەم پەروەردەکردنەش، ئارامیو ئامانجەکان لەنێو کۆمەڵگادا بەدی دێت، هەر خەمخۆرو دڵسۆزێك، یان هەر لایەنو گرووپێك، بیەوێت کۆمەلگاکەی پێش بخات؛ دەبێت سەرەتا لە پەروەردەکردنی تاکەوە دەست پێ بکات.

* گۆڤاری بڕیار..

بڵاوکراوەیەکە، ئامانجێتی تاکێکی ئامانجدارو بەئەزموونو چالاك پێ بگەیەنێت.

* گۆڤاری بڕیار..

دەیەوێت کۆمەلگایەك بونیاد بنێت، کە مرۆڤ تێیدا نرخو سەنگی هەبێتو بێبایەخ سەیر نەکرێت.

* گۆڤاری بڕیار..

هەوڵ دەدات، وا لە مرۆڤ بکات، لەگەڵ هەموو جۆرە بارودۆخێکدا، هەڵ بکاتو چۆك بۆ هیچ بەربەستێك دانەدات.

* گۆڤاری بڕیار..

دەیەوێت کۆمەلگا نەبێتە گۆڕستانێك، بۆ ناشتنی خەونی تاکەکانی ئەم کۆمەلگایە.

* گۆڤاری بڕیار..

هەوڵ دەدات تواناو لێهاتوییەکان پەرە پێ بداتو هەمان کاتیش دڵنەوایی هەژارانو بێنەوایان دەکات.

* گۆڤاری بڕیار..

وا لە خوێنەرانی دەکات، دوور بن لە لێکڕەنجاندنو شکاندنی یەکتر، وامان لێ دەکات سۆزو میهرەبانی لەنێو یەکتردا پەخش بکەین.

* گۆڤاری بڕیار..

دەیەوێت ئاڵای ڕەوشت هەمیشە لەنێو کۆمەلگادا، لە هەموو ئاڵایەکی تر بەرزترو شەکاوەتر بێت.

* گۆڤاری بڕیار..

دەیەوێت بازرگانەکان بەویژدان بنو پێشەواکان دادپەروەرو مامۆستایان خەمخۆرو پزیشکەکان دڵسۆز بن.

دڵنیام ژیان لەو کۆمەلگایەی ئێوە دەتانەوێت ژیانێکی ناوازەیە، کەس فێڵ لە کەس ناکاتو هەرگیز کوشتو بڕو ناکۆکی لەنێو کۆمەلگاکەتان جێی نابێتەوەو خەمو ئازار، هەواری خۆی لەنێو کۆمەلگاکەتان دەپێچیتەوەو سەری خۆی هەڵدەگرێت.

دیارە هیچ کارێك بێ کەموکووڕی نییە، هەربۆیە هیوای بەرەو پێشچوونی زیاترو بەردەوامی بۆ ستافی گۆڤارەکە دەخوازینو بەهیواین لێ براوانەترو دڵسۆزانەتر برەو بە گۆڤارەکە بدەن، ماندوو نەبنو سەرکەوتوو بن لە هەوڵەکانتان، بۆ بونیادنانی کۆمەلگایەکی تەندرووستو پێشکەوتوو.






# بەیادی شارەزووری
## مامۆستاو پێشەوا

سـاڵی ١٩٨٥ من هێشـتا منداڵ بووم، کە مامۆستا شارەزووری تەشـریفی هێنا بـۆ شـارۆچکەی ئاغجەلەر، وەلـێ هاتنی ئەو، گەورەترین شوێنەواری لەسەر ژیانی من بەجێ هێشت.

ئـەو کات مـن، دەرچووبووم بـۆ پۆلی چوارەمی سـەرەتایی، لەبیرمە ئەو ساڵە هاوینەکەی -کاتی پشوو- لە ئاهەنگێکدا کە بۆ خولی هاوینەی قوتابیان سـاز کرابوو، جەنابی مامۆستاش لەگەڵ مامۆستـاو پیاوماقووڵانی شـاردا بانگ کرابوون، من لەوێدا، بەو منداڵییەم، لەسـەر شانۆ، شـیعری (ئەی ئاڵای بەرزی سێ ڕەنگی جوان)ی قانعی شـاعیرم خوێندەوە، کـە وەختی خۆی، بۆ ئاڵای کۆماری مهابادی نووسیبوو!

دوای عەسـر، مامۆسـتا شـارەزووری هات بۆ ماڵمان، هێشـتا دانەنیشتبوو، لێی پرسیم: ئەو شیعرە، کێ پێی گوتی بیخوێنەرەوە؟ گوتم: هەر بۆ خۆم ئارەزووم لێ بوو!

گوتی: یانی کەس بۆی هەڵنەبژاردووی‌و ئاراستەی نەکردووی؛ بۆئەوەی لەو هەموو شیعرەی قانعدا، ئەو شیعرە هەڵبژێری؟!

گوتم: نەخێر، هەر بۆ خۆم ئەوەم هەڵبژاردووەو ئەو شیعرەم زۆر بەدڵ بوو!

لەوێدا بانگی باوکمی کردو گوتی: شـێخ محەممەد، ئاگات لەم کورە بێت، هەموو ژیانی کێشەو نارەحەتی دەبێت! دواتر تووشی هەرچی دەهاتم، باوکم دیگوت: مامۆسـتا شارەزووری کەرامەتی هەبوو! باشی ناسیت!!

هاتنی مامۆستا شارەزووری، گەورەترین وەرچەرخانی لە مێژووی ناوچەکەدا درووسـت کـرد، مامۆسـتا بەرنامەیەکـی پەروەردەیی گشـتگیری بۆ هەموو چین‌و توێژەکان دانا، لەبیرمە وانەی تایبەتی هەبـوو؛ بۆ لاوان، بـۆ مێردمنداڵان، بۆ فەرمانبـەران، تەنانەت بۆ ئافرەتـە بەسـاڵاچووەکانیش وانەیەکـی تایبەتـی هەبـوو، وێڕای نووسـین، کە کتێبی "فرۆید"ی لە ئاغجەلەر نووسی‌و دوای ئەویش خەریکی "هەگبەی شارەزووری"بوو، کە بەداخەوە تەواوی نەکرد.

گەیشـتنم بە خزمەتی مامۆستا، دانانی بناغەی هەموو ژیانم بوو، گرنگیدانی ئەو بە من، منی بە زۆر پلەی بەرز گەیاند.

بەڕێزیـان لە بـەر گرنگیدانی تایبەتیان، منیـان لەگەڵ ئەو مامۆسـتاو فەرمانبەرانەدا دانابوو، کە پلەی خوێندن‌و تەمەنیان بەرز بوو، دوای عەسران "فقه السنة"و "تەفسیر"ی پێ دەگوتین.

لە لای جەنابی باوکیشـی "مامۆستا مەلا ساڵحی زارا" دەرسی قورئانم دەخوێند.

ئەو سـاڵەش، سـەرەتای دەسـتکردنم بوو بە فەقێیەتی، لای مامۆسـتا مەلا محەممەد ئەمین ئاغجەلەری، (ڕەحمەتی خودای لێبێت) کە "آجرومیة" دەستم پێ کردبوو!

زۆرکات دەچوومـە خزمەتی‌و هەرکات پێـم کرابا، دەچوومە ژوورەکەی دادەنیشـتم، هەوڵم دەدا لە هەموو شـتێکدا چاوی لێ بکەم. لەیادمە دوای عەسـرانێکی زسـتان چوومە کنی؛ بۆئەوەی کتێبی لێ وەربگرم بۆ خوێندنەوە، هەرچی ئەو گوتی بە کوردی، من خوێندبوومەوە، ئەو کات بەزۆری تەنها کتێبەکانی مامۆسـتا حەبیب محەممەد سەعیدو مامۆستا حەسەن پێنجوێنی‌و مامۆستا ئەحمـەدی کاکە مەحموود هەبوون، لـە کۆتاییدا ناوی کتێبێکی گوت کـە نەمخوێندبۆوە، ئەویش ڕۆڵەی شـیرینم "أيها الولد"ی ئیمامی غەزالی بوو بە کوردی.

ئەو کتێبەش، کە وێنەی پێشکەشـییەکەی دەبینن کە "مبادئ الإسلام"ی ئەبو ئەعلای مەودودییە، بە تەڵەمشکێنە لە مامۆستام بردۆتەوە، بەڵام ئەو کردی بە دیاری‌و منیش هیچم نەگوت!!

زێتر لە دوو ساڵ لە خزمەتی مامۆستا شارەزووریدا بووم، زۆر شتی لێوە فێربووم.

گەورەترین کەس لە مامۆسـتاکانم، کە کاریگەرییان بەسـەر ژیانمەوە هەبوو بێت‌و خۆم بە یەکێك لە حەسـانەتەکانی بزانم، مامۆستا شارەزوورییە!

ئەمـەی لێرەدا نووسـیومە، تەنهـا یادەوەرییەکی خێرایە، لە سـاڵیادی کۆچی دوایی ئەو کەڵە زانایەدا، کە دەکەوێتە بەرواری ١٩٨٧/٧/٢٥، تەنهـا ئەوەنـدە دەڵێم، کە من لە مامۆسـتاوە، فێری ئیسلامی ڕاسـتەقینەو جوامێـری، هەقبێـژی‌و بۆخوازیـان‌و خۆشەویسـتیی ئیسـلام‌و ئـەدەب‌و شـیعرو گەیاندنـی پەیامی پێغەمبەران‌و سادەیی‌و کارکردنی بێدەنگەدەنگ‌و هێمن بووم.

فێربووم ئەگەر هیچم پێ نەکرێت، خۆ نەفرۆشم‌و نەگۆڕێم‌و نەدۆڕێم!!

هـەزاران ڕەحمەتی خودا لە مامۆسـتای شـارەزوری، خودای گەورە لەبەهەشتی بەریندا کۆمانبکاتەوە..

قوتابی چکۆڵەت: عادل شێخانی



# نامە نوورسەکان

## نامەی پەنجاوپێنج

ع. ش. شێرکۆ

پێغەمبــەری ئازیزﷺ لە فەرموودەیەکــدا، کە هەردوو پێشــەوای فەرموودەناســان: ئیمامــی بوخــاریو موســلیم ڕیوایەتــی دەکــەن، زۆر جوان ئەم ســەردەمەی ئێمە، وێنا دەکاتو دەفەرموێت:

إنَّ اللهَ لا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنْ الْعِبَادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا.

واتــە: خودا زانســت لە بەندەکانــی ناســەنێتەوە، بەوەی لــە خەڵکی وەرگرێتــەوە، یاخود وەکــو لــە ڕیوایەتێکی دیدا دەفەرموێــت، لە ســنگی زانــای وەدەردەنێ، بەڵکــو بە مردنو لەنێوچوونی زانایان، زانســت لەنێــو دەچێت، تا کاتێك زاناکان دەمــرنو نامێنــن، خەڵکی ســەرانی نەزان، دەکەنە پێشــەوای خۆیان، ئەوانیش کاتێك پرسیاریان لێ دەکرێت، بەنەزانی فەتوا دەدەن، بەو کارەش خۆیانو شوێنکەواتووانیان گومڕا دەکەن!

زانایانی ئیســلام، جێگــری پێغەمبەرو واریســی نووری نبووەتــن، خوداوەنــد پەیمانــی لــێ وەرگرتــوون، کە ئەو پەیامەی پێیان بەخشــراوە، دەبێ بیگەیەننو هیچ زانستو زانیارییــەك لــە خەڵکی نەشــارنەوە، ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾ آل عمران: ١٨٧.

چونکە مەقامی ئەوان ســەختەو ناکرێ هەرگیز بەیانی هەقو ڕاســتی فەرامۆش بکــەن. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ

﴿ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ﴾ البقرة: ١٥٩.

چونكە ئەوان كەسانێكن، بە ئیختیاری خۆیان، ئەو مەقامە بەرزەیان هەڵبژاردووەو كەسێكیش كە لەو پلەیەدا بێت، دەبێت وەها بێت، كە خوداوەند وەسفی دەكات.

﴿ الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ ﴾ الأحزاب: ٣٩ ئەوان چۆن وەها نابن، لە كاتێكدا دەزانن ﴿ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا ﴾ الأحزاب: ٣٩

زانایان مەرجەعی عیلمو مەئمەنی كاتی خەتەرو چرای زەمەنی فیتنەن.. ئەوان شوهەدای خودان بەسەر ئەم ئوممەتەوە لە دوای پێغەمبەر!

خوداوەند لە دووی خۆیو فریشتەكان، وانی كردووە بە گەواهیدەر لەسەر وەحدانیەتی خۆی ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ﴾ آل عمران: ١٨

وەلێ نەمانی زانایانی شەرعناسو لەخواترسو چاونەترسو راستگۆو دنیانەویستو ئاخیرەتویست، لە نیشانەكانی ئاخیری زەمانەو پێغەمبەری ئازیزمان فەرموویەتی: (لە نیشانەكانی ئاخر زەمان، نەمانی عیلمو زانینو بڵاوبوونەوەی نەزانیو جەهلە) -بوخاریو موسلیم-

زانایانی پێشین، وەها تەعزیمی خودا، دڵو دەروونی داگیركردبوون، كە هیچ هێزو تواناو دەسەڵاتێك، هەیبەتو مەكانەتی لەنیو دڵیاندا نەمابوو!

ترسی خودا جێگای بۆ ترسو پەروابوون لە كەسی دی نەهێشتبووەوە!

بۆیە بووبوونە سوڵتانی دڵو گیانی خەڵكو پێشەوای راستەقینەی ئەهلی ئیسلام!

ئەوان دونیایان خستبووە ژێر پێو چاویان لە مەتاعی فانیی ئەم دونیایە نەبوو، زوهدو تەقواو وەرعو بۆخواژیانو بۆخواسوڵحان، سیمای هەمیشەیی زانایانی رەببانیو ئەهلی حەقە!

نە لە كەس دەترسانو نە چاویان لە دەستی كەس بوو، نە بەهیوای خەڵاتی كەس بوون، جگە لە خودای گەورە.

سولەیمانی كوڕی عەبدولمەلیك، چوو بۆ لای سەلەمەی كوڕی دینار، كە یەكێكە لە تابعینو پێشتر كۆیلەیەكی خەڵكی وڵاتی فارس بوو، لێی پرسی: ئەبوحازم، بۆ رقمان لە مردنە؟!

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: چونكە ئاخیرەتی خۆتان وێران كردووەو دونیاتان ئاوەدان كردۆتەوە، هەڵبەت كەسیش پێی خۆش نییە، لە ئاوەدانییەوە، بچێت بۆ وێرانە!

گوتی: راست دەكەیت..!

پاشان لێی پرسی: گەڕانەوە بۆ لای خودا چۆنە؟!

سەلەمە لە وەڵامدا گوتی: مرۆڤی چاكەكار وەك موسافیرێك بگەڕێتەوە بۆ نێو ماڵو منداڵی، خراپەكاریش وەك كۆیلەیەك، لە گەورەكانی هەڵاتبێو بگەڕێتەوە بۆ لای!

سولەیمان گریاو گوتی: خۆزگە دەمانزانی، چیمان هەیە لای خودا!

سەلەمە گوتی: خۆت نمایش بكە بەرامبەر قورئانی پیرۆز، ئەو كات دەزانی لای خودا چۆنی!

پرسی لە كوێدا بزانم؟ گوتی: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ ﴾ الانفطار: ١٣ - ١٤

جارێكی دی سولەیمان پرسی: ئەی كوا رەحمەتی خودا؟ سەلەمە گوتی: ﴿ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ الأعراف: ٥٦

سولەیمان داوای ئامۆژگاری لێ كرد! سەلەمەش پێی گوت: بترسە لە خودا، كە لە شوێنێك بتبینێ، كە پێی خۆش نییە! لە شوێنێ نەتبینێ كە پێی خۆشە بتبینێ..

دواتر داوای دوعای خێری كرد!

سەلەمەش گوتی: خودایە، ئەگەر سولەیمان خۆشەویستی خۆتە، رێگای خێرو چاكەی بۆ ئاسان بكە، ئەگەر دوژمنی تۆشە، نێوچەوانی بگرە بەرەو چاكە!

هەر ئەم پیاوە بەرزە دەڵێت: زانایانم بینی، كە میرو پاشاو سوڵتانەكان لەبەر دەرگاكانیان، وەكو كۆیلە راوەستابوون! بەڵام ئەمڕۆ زانایانو خواپەرستان، خۆیان دەچنە بەر دەرگای میرو سوڵتانو دەوڵەمەندەكان، كاتێكیش ئەوەیان بینی، لەبەرچاویان كەوتنو بەسووك تەماشایان كردن؛ چونكە لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت، ئەگەر ئەوەی بەدەست ئێمەوەیە، باشتر نەبێ لەوەی بەدەستی ئەوانەوەیە، نەدەهاتنە بەر دەرگامان!!!

سەبارەت بە دونیای فانیش دەڵێت: ئەوەی لە دونیا رۆیشتووە، خەوبوو، ئەوەشی ماوەتەوە، تەنها خۆزگەیە!

هەروەها دەڵێت: تەماشا بكە، ئەوەی حەز دەكەی لە قیامەتدا لەگەڵتدا بێت، لە ئێستاوە بینێرە بۆ ئەوێ! ئەوەشی كە پێت ناخۆشە لەگەڵت بێ، لە ئێستاوە وازی لێ بهێنە.

سەبارەت بە دوژمنی سەرسەختی هەموانیش دەڵێت: ئیبلیس چییە؟ گەر لێی یاخی بیت، هیچ زیانێك ناگەیەنێت.. بە فەرمانیشی بكەی، هیچ سوودێكت پێ ناگەیەنێت.

رەحمەتی خودا لە سەلەمەی كوڕی دینار



# لەگەڵ مەلا غەفووری مهابادی شاعیردا

شاعیر ناوی غەفووری کوڕی دەروێش عەبدوڵلایە، ناسراوە بە حافزی مهابادی، ساڵی ١٩٢٧، لە شاری سەقز لەدایکبووەو ساڵی ١٩٩٠ کۆچی دوایی کردووەو لە نزیك گڵکۆی هێمنی شاعیر، بەخاك سپێرراوە.

شاعیر وێڕای لەدەستدانی بینایی چاوەکانی هەر لەتەمەنی منداڵییەوە، بەڵام خاوەنی توانایەکی شاعیرانەی زۆر بەرزەو دیوانی ئاسۆی ڕوون گەواهیدەرە.

ئەمەش چەند نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

(گۆمی خوێن)پێنج خشتەکی لەسەر شیعری مامۆستا هێمن:

هەڵت واسی بە کەزیەو بەژنی شۆڕا
دڵت بردم لە سینی هەشتو نۆڕا
بەجێت هێشتم لەناو شینو شەپۆڕا
عەزیزم بۆچی تۆراوی لە خۆڕا
چ قەوماوە، دڵی تۆ، بۆچی گۆڕا؟
کە تۆ ڕۆیشتی، بۆ من دەردو خەم ما
هەناسەی بێکەسیو فرمێسکی چەم ما
کەژی هیوام لەژێر بارستی تەم ما
ئەتۆ وا زوو لەبیرت کردم ئەمما
فەرامۆشت نەکەم شەرتە لەگۆڕا
وەتی تۆ زیزی، من کنارم کراوە
لەژێر باری خەفەت پشتم چەماوە
لە حاندم دڵڕەقی، ڕەحمت نەماوە
لە من ڕا، خۆ خەتایەك ڕووی نەداوە
ئەدی بێمەیلی، بۆ ڕووی دا لە تۆڕا
لە تۆڕایە خەمو دەردو کوڵی من
بەدەس تۆیە ڕووناکیی مەنزڵی من
لە باغی ژین، ئەتۆی تەنیا گوڵی من
ئەسیری کەزیەتە، کۆتری دڵی من
دەبێ حاڵی چ بێ، کۆتر لە تۆڕا
لەسەر چی زیزی، زۆرت بۆ پەرۆشم
لەدەستم داوە، ژینو ڕۆژی خۆشم
دەبێ وەك تازیەداران ڕەش بپۆشم
سەرو ماڵو کەمالو بیروهۆشم
لە نەبەردی عیشقی تۆدا پاکی دۆڕا
بە ئاهم سیسو ژاکاوە گوڵی ژین
بە بەژنی من بڕاوە ماتەمو شین
لەسەر ڕووم ئاشکرایە شوێنی ئەسرین
لەچاوم دێ بەخوڕ فرمێسکی خوێنین
کەچی ئەم گۆمە خوێنە، هەڵنەچۆڕا
هەموو یارانی مەجلیس، دەس لەناو دەس
بە شوێن ئاواتی خۆیدا ڕۆیی هەر کەس
بەجێ ماوم منی داماوو بێکەس
منو لاشەی پەپوولە، مایننەوەو بەس
شەوی دووریی شەمیش تواوە لە کۆڕا

بەشێك لە(بۆسەی ڕۆژگار)پێنج خشتەکی لەسەر شیعری مامۆستا هێمن:

هیچی لێ نابینی کوێستانی هومێدم، تەم نەبێ
زەردە، ڕوو ناکاتە سەر لێوم، لە لێوی چەم نەبێ
کەس بە جەستەی گیانی ناشادو دڵی خەستەم نەبێ
نیمە ئاواڵێ لە گۆشەی بێکەسیدا، غەم نەبێ
چاکە ئەو لێرەش، وەفای هەر ماوە، سایەی کەم نەبێ
پیرەمەینەت تاقەهاوڕێمە، قەتم لێ جیا نییە
بۆ سەعاتێکیش تەنانەت خێروخۆشیم لا نییە
نەگبەتی وەك من لەژێر ئاسمانی شین پەیدا نییە
لاپەڕەی ژینم هەموو هەڵدەیتەوە، تێیدا نییە
باسی فرمێسكو هەناسەو شیوەنو ماتەم نەبێ

دیپلۆمو لیسانس

پێت وا نەبێ هەرچێکی کە دیپلۆمو لیسانسە
ئوستادت فنوونە، وەکوو ئینگلیسو فەڕانسە
دیپلۆمی ئەوان، سەنعەتی ئێف ئێمی لەدەس دێ
یا موختەریعی ڕادیۆیی لوکتۆرو لۆرانسە
دیپلۆمی وڵاتی مە، هەموو کۆششو سەعیی
فێربوونی دوو سێ لەفزی وەکوو فۆرسو سیرانسە
زۆر وا هەیە، چەن ساڵە کە خوێندوویە، نەتیجەی
عیلمو هونەری، پیشەیی ڕەققاسیو دانسە
یا هەر دەبێ، دەس دادەنو قوونیان لە حەوا کەن
خوا بیبڕێ، یانی ئەمە فێربوونی بەلانسە
چت داوە لەوە حافزی بێچارە، بە تۆ چی؟
وا دیارە، هەموو کارێ، بە ئیقباڵو بە شانسە